



# پرسی کورد و ئەزموونی کوردستانی عێراق

## بیرەوەریەکانی بەهادین نوری لە چلەکانی سەدەی بیستەمەوە هەتا ئەمڕۆ تایبەت بەکوردستانی عێراق

بەهادین نوری
کوردستانی عێراق / سلێمانی

# پرسی کوردو
# ئەزموونی کوردستانی
# عێراق

بیرەوەریەکانی بەهادین نوری لە چلەکانی سەدەی بیستەمەوە
هەتا ئەمڕۆ تایبەت بە کوردستانی عێراق

کوردستانی عێراق / سلێمانی

ئابی ٢٠١٨

# پێناسی کتێب


- ناوی کتێب : پرسی کوردو ئەزموونی کوردستانی عێراق
- نووسینی : بەهادین نوری
- بابەت : بیرەوەریەکانی بەهادین نوری
- تایپ : حسن محمد و ڕێبوار کمال
- تیراژ : ٣٠٠٠
- نۆبەی چاپ : چاپی یەکەم
- چاپخانە : زانا
- ژمارەی سپاردن: (١٦٧٨)ی ساڵی ٢٠١٨ی وەزارەتی رۆشنبیری پێ دراوە.

## پێشکەشە :

بۆ گیانی پاکی ئەو ڕۆڵە تێکۆشەرانەی خۆیانکردە قوربانی گەل و نیشتیمان و چوونە ڕیزی شەهیدان، بۆ ئەو سەربازە نەناسراوانەی کە بە هزرو بازووی ئەوان کوردستانێکی دیموکراتی پێشکەوتوو بنیاتدەنرێ و عەدالەتی کۆمەڵایەتی بەرجەستە دەکرێ.

# سەرەتا

خوێنەری بەڕێز !

ئەمەی لێرەدا دەی خوێنیتەوە بە ئەدرەسی ( پرسی کورد و ئەزمونی کوردستانی عێراق ) لە واقیعدا بیرەوەریەکانی خۆمە لەماوەی زێتر لە ٧٠ سالّی ڕابردوودا ( لە چلەکانی سەدەی بیستەوە تا ئیستە ). من مێژوو نووس نیم، بەڵام لە سالّی ٩٤٦ وە چومەتە ناو سیاسەت و حیزبایەتی و هاوچەرخی هەموو ڕووداوەکانی عێراق بووم بە کوردستانیشەوە. جەلدی یەکەمی بیرەوەریەکانی خۆم لە ١٩٩٦ دا بە عەرەبی چاپکردووە. جەڵدی دوەمیشم نوسیوەو هێشتا بڵاوم نەکردۆتەوە. ئەم نامیلکەیەش کەبەکوردی نوسیومە تەواوکەری ئەو دوکتێبەیە. لەم کتێبەشدا ڕووداوەکانم وەکو خۆیان باسکردووە بەبێ هیچ گۆڕانکاریەک. هێندەش پێوەندی هەبێ بە کۆمێنت و شیکردنەوەی ڕووداوەکان ئەوە ڕاوبۆجوونی خۆمە تەنها خۆم بەرپرسیارم.

لەم نوسینەدا ناوی حیزب و کەسایەتی زۆر هاتووە. دەمەوێ لێرەدا بڵێم کە من هیچ کاتێ دوژمنایەتی شەخسی وکێشەم لەگەڵ هیچ کەسێ لەوانە نەبوەو نیە. من لە ڕوانگەی بەرژەوەندی گەل ونیشتیمانەوە باسی کارو باری سیاسیم کردووە، هەڵوێستی خۆم دەربریوەو وەک و مارکسیەک، بەرگریم لە مافی نەتەوەیی ڕەوای گەلەکەم کردووە کە دووچاری دابەشکردن و ژێردەستەیی بوون بە پێی بەرنامەی ( UN ) و پرنسیبی مرۆڤایەتی و نیو نەتەوەیی مافی بریاردانی چارەنووسی خۆی هەیەو لێیداگیرکراوە. من لە سالّی ٩٥٢، کاتی سکرتیری حشع بووم، ئەم هەلویستەم وەرگرتووەو تۆمار کراوە لەبەرنامەی حشع دا.

میللەتی کورد یەکێکە لەومیللەتە گەورانەی سەر ئەم گۆی زەمینە کە ژمارەی خەڵکەکەی لەسەروی ٤٠ ملوێنەوەیەو تا نیستە، چەرخی نینتەرنێت و ئەم پێشکەوتنە خەیاڵیەی زانست و تەکنیک، بێ بەشە لەمافی نەتەوەیی ڕەوای خۆی. هەمەوو ئەو کوردە تیکۆشەرە نەتەوەییانەی کە ئالای خەباتیان هەڵگرت لە پێناوی مافی ڕەوای گەلەکەیاندا، وەک دامەزرینەری حیزبی هیوا ڕەفیق حیلمی و دامەزرینەران و تێکۆشەرانی پارتی مستەفا بەرزانی و ایبرایم احمد و جلال تالەبانی و هەمزە عەبدولا و نەوشیروان مستەفا و علی عبدوالله و نوری شاوەیس و مەسعود بەرزانی و ساڵح یوسفی و کەمال فوئادو علی عەسکەری و فوئاد معصوم و سامی عبدلرحمان و عدنان مفتی و محمود عوسمان و ڕەسوڵ مامەند و جوهر نامیق و گەلێ کەسی دیکەش، هەمەوو شایستەی ریزو تەقدیرن وەک دەستەی پێشەنگی بزوتنەوەی نەتەوەیی رزگاریخوازی کوردستان. بە بۆچونی من ئەم برایانە ئەگەر تووشی هەڵەش بووبن، سالانی پێش وەرگرتنی دەسەلات لە ٩٩١ دا، چاوپۆشیان لێدەکری، جگە لە هەڵەی شەڕی برا کوژی کە بوو بە خۆرە یەکی کوشندە لە شۆڕشی کوردا.

# پێشەکی یان دیوەکەی تری شۆڕشی کورد

٥٧ ســـاڵ لەمەوبەر، لە ئەیلـــولی ١٩٦١، بـــزوتنەوەی چەکـــداری کوردســـتانی عێـراق دەسـتی پێکـرد بە بڕیـاری سـەرکردایەتی پـارتی بەهەردوو باڵەکەیەوە، باڵی مستەفا بارزانی سەرۆکی حیزب و باڵی مەکتەبی سیاسی کە ابیراهیم احمد سکرتیری بوو. لەمەودای ئەم ٥٧ ساڵەدا بزووتنەوەکە بە وێستگەی جۆراو جۆردا تێپەڕیوە، سەرکەوتن و تێشکانی بە خۆیەوە دیوە، میللەتی کوردیش گەلێ ڕۆژانی خۆش و ناخۆشی دیوە، ڕۆژێ شایی و هەڵپەرکێ و ڕۆژێ شین و واوەیلا.

ئەرکی هەرە قورسی ئەم شۆڕشە بەسەر شانی پێشمەرگە گەنجەکانەوە بـــووە کە لەو ســـاڵانەدا دەیـــان هەزار شـــەهیدیان داوە و هەزاران کەمئەندامیان جێهێشتووەو هەزاران بەدیل گیراون و کوژراون. بەشێکی گەورەش لەو ئەرکە کەوتبووە سەر شانی گوندنشینانی کوردستان کە لە نیوە شـەودا بە ڕوی خۆشـەوە لەخەو هەڵدەسـتان بـۆ پێشوازی لە پێشمەرگە و دابین کردنی خواردن و ئیسراحەتیان. بەبێ یارمەتی ئەو گوند نشینانە پێشمەرگە بەهیچ کلوژێ نەیدەتوانی ئەو شەڕە بکات. بەڵـگەی ئەمەش دەرکەوت پـاش ئەوە کە سـەدام هەمـوو گونـدەکانی هەرێمی ڕووخاند، لە ساڵی ٩٨٨ دا. شاریش ڕۆڵی خۆی هەبوو، باجی خۆیـدەدا، بەیـانێکی نۆپۆزسـون بە دیـوارێکەوە هەڵواسـرایە ت خـانوەکە دەڕوخێنرا یان لانی کەم خاوەن ماڵ دەخرایە بەندینخانەی بە عس.

کەس نـــازانێ لەم ٥٧ ســـاڵەدا چ مەینەتـــی و دەردیـــسەری و نەهـامەتیەک تووشـی ئەم وڵاتە بـووە ئەوانە نەبـی بەچـاوی خۆیـان دیویـانە. بڕیاربەدەسـتانی شـۆڕش بەدرێژایـی ئەم ٥٧ سـاڵە بۆتـاکە جارێکیش لە میللەتەکەی خۆیان نەپرسی :

- ئێوە، ئەی خەڵکی کوردستان، ڕاتان چیە بەم شۆڕشە کە بەناوی ئێوەوە بەرپامان کرد؟

لەم ٥٧ ساڵەدا یەکێ لەسەرکردەکانی پارتی بیری لەوە نەکردەوە دیراسەیەک لەسەر ئەم پرسە بنووسێ، هەوڵی شیکردنەوەیەکی بابەتیانەی ئەوهەمور بەسەر هاتە تاڵەی وڵاتەکەی بدات و بپرسێ: ئەمە بۆ وەها ڕۆیشت و کێ بەرپرسیارە لەم هەڵە گەورانە؟ پاش هەڵگرتنی چەک بە ٢٧ ساڵ، هاوکات لەگەڵ وەستانی شەری عێراق - ئێران، شۆڕشی کورد خۆی لەنێو تونێلێکی تاریکدا دیتەوە: هەموو گوندەکانی کوردستان ڕووخێنراوون و بەبیلدۆزەر تەختکراون، پرۆژەی سەدام سەبارەت بە کیمیاباران و ئەنفال جێبەجێکراوە، پاشماوەی پێشمەرگە دەرکراون تا ئەودیوی هێڵی سنور لەگەڵ ئێران، هەزاران پێشمەرگەو لاوانی تێکۆشەر چوون، یان لەهەوڵدان بچن بۆ دەرەوەی وڵات لەشوێن پەنابەری. ئەم هەموو مەینەت و کارەساتە بەسەر میللەتی کوردا هات و نقەی نارەزایی نەبیسترا، نە لە ئەمریکا نە ئەورووپا نە مۆسکۆ نە لە ڕێکخراوێکی جیهانی، پێش کیمیابارانی هەڵەبجە. ئەگەر سەدام دەستی بۆ ( بڤە ) نەبردایە، ئەگەر کوێتی بە خۆیی و نەوتەکەیەوە نەگرتایە، ڕەنگبوو تائیستاش میللەتی کورد لەو تونێلە تاریکەدا گیرۆدەی دەستی سەدام و عودەی بوایە. بەڵام گومڕایی و بێعەقڵی خودی دیکتاتۆر دۆخێکی وەهای خوڵقاند کە زلهێزەکان گورزێکی کوشندەی لێدەن و هەرێمی کوردستانیش لە ١٩٩١ وە ڕزگاری ببێ و بۆیەکەم جار لە مێژودا بۆماوەی ١٢ ساڵ سەربەخۆ بژی لەسایەی حکومەتی خۆیدا بەسەرپەرشتی سەرانی پارتی و یەکیەتی. پاش ڕووخانی سەدامیش ( ٢٠٠٣ )، ١٥ ساڵی دیکەش حکومەتی هەرێم وەکو بەشێ لەدەوڵەتی عێراق هاتۆتە کایە. واتە ٢٧ ساڵە پارتی و یەکیەتی حکومڕانی ئەم هەرێمەن. ( ٣٠ ) ساڵیش پێش

ئەمە ( ١٩٦١ ـ ١٩٩١ ) سەرکردایەتی خەباتی چەکداری کوردیان کردووە. واتە ٥٧ سالە ئەم دوحیزبە، وردتر بلێین سەرانی ئەم دوحیزبە سەرکردایەتی بزوتنەوەی چەکداری و دواتر حکومڕانی هەرێمییان کردوە.

من لەورۆژەوە چومە ڕیزی حشع تائیستەش ٧٣ ساڵە، هاوجەرخی ڕوداوە سیاسیەکانی ئەم ٧٣ ساڵەم چ لە کوردستاندا چ لە هەمو عێراقدا. لە ئاخرو ئۆخری ژیانمدا بە پێویستم زانی بیرو بۆچونی خۆم سەبارەت بە هەڵسەنگاندنی ئەم ٥٧ ساڵە لە مێژوی بزافی چەکداری و دواتر حکومڕانی هەردو حیزبی نەتەوەیی. کە لە ئەسڵدا یەک حیزب بوون ـ بخەمە سەر کاغەز بۆ نەوەی ئەمڕۆش و نەوەکانی ئایندەش. خۆزگە خەڵکی دیکەش لە ڕۆشنبیران و مێژونوسان بە ئەرکی خۆیان هەڵسایەن، بیرو بۆچوونی خۆیان بخستایەتە ڕوو چ لە شێوەی موناقەشەیەکی بابەتیانەی ئەم تێزانەی منەوە بوایە چ لە شێوەی وتارو کتێبی تایبەت بە خۆیانەوە بوایە.

من بەلامەوە عەجیب نیە ئەگەر سەرکردەکانی بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد لەوڵاتێکی دواکەوتوی وەک ئەم وڵاتەی ئێمەدا، لەهەوڵی بەدەسهێنانی مافی نەتەوەیی و ڕەوای گەلەکەیاندا، تووشی هەڵەی جۆراو جۆری گەورەو بچووک ببن. چوونکە بە ڕێگەیەکدا دەڕۆن کەلەوەو پێش پێیدا نەڕۆشتوون، ڕوو بە رووی نەیارێک دەبنەوە کە بە عەقڵ و لۆژیک قسە ناکات، مامەڵە لەگەڵ کەسانێکدەکەن کە دەسەڵات و سوپاو پۆلیس و بەندینخانەیان لە دەستدایە.

ڕەگوڕیشەی کێشەی کورد دەگەڕێتەوە بۆ مێژوویەکی دوری ئەم وڵاتانەی کوردیان تێدا دابەش کراوە : ئیمپراتۆریەتی عەباسیەکان و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و دەولەتی فارس. کورد هەمووکاتێ بەش بەش بووە لە نێوان ئەمانەدا و زۆر کات ئاینیش یارمەتی دەر بووە بۆ

لکاندنی کورد بە یەکێ لەم دەوڵەتانەوە. دابەش بوونی کورد کۆسپی سەرەکی بووە و تا ئیستەش سەرەکییە لە رێگەی دروستبوونی دەوڵەتێکی کوردیدا. تەنها لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم هەلێکی لەبار هاتە کایەوە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی لەلایەن بەریتانیاوە . کورد ئامادەبوو، هەوڵی بۆدا، حکومەتی شیخ مەحمودی حفید لە سلێمانی دامەزرێنرا، ساڵێک مایەوە، بەڵام ئیمپریالیزمی بەریتانی رێگر بوو.

بە هەرحاڵ بێ پێویستە ئەوڕاستیە بزانین کە لە دۆخی ئەمڕۆدا هیچ ئاسۆیەک لەبەردەم کوردستانی عێراقدا نیە بۆ سەربەخۆیی ئەم میللەتە لە رێگەی زەبرو زۆر و چەکداریەوە. رێگەی گەیشتن بە هەموو مافێکی رەوای ئەم گەلە رێگە خەباتی ئاشتیانەیە لە سایەی عێراقێکی دیموکراتیدا. ئیستە نە عێراقی دیموکراتی هەیەو نە هەرێمێکی دیموکراتی.

با بگەڕێینەوە سەر ٥٧ ساڵەکەی خەباتی چەکداری و حکومڕانی لەلایەن هەردو حیزبی نەتەوەیی کوردەوە، پارتی و یەکیەتی. لەم کتێبەدا باسی هەڵەکانیانم کردووە کە هەردوکیان لەسەر یەک ئاست بەر پرسیارنین. هەڵەهەیە بەتەنها لایەکیان بەرپرسیارەو هەڵەش هەیە هەردو لا وەک یەک بەرپرسیارن یان لایەکیان زیاتر بەر پرسیارە. لەم پێشەکیەدا ئاماژە بۆ ئەم هەڵانە دەکەم و دواتریش کەمێ بە درێژی لە کتێبەکەدا دەیخوێنیتەوە :

١ــ هەر لەســەرەتاوە، لە ١٩٦١ دا، دەســپێکردنی خەبــاتی چەکــداری هەڵەیەکی ستراتیجی گەورەبوو پارتی بە هەردوو باڵەکەیەوە کردی.
٢ـ لە ٩٦٦ ـ ٩٧٠ باڵی مەکتەبی سیاسیی بەسەرکردایەتی ئیبراهیم احمد هەڵەیەکـی کوشندەی کـرد کە چەکـی هەڵگـرت بە هاوکـاری بەغدا دژی کورد.
٣ـ لە ١٩٧٥ ئاشـبەتاڵی پـاش ڕێکەوتنـی جەزائیـر تێـشکانێکی زۆر گەورە بوو بۆ کورد. مستەفا بەرزانی بەتەنیا بەرپرسیارە لەم تێشکانە.
٤ــ ٣١ ئــابی ١٩٩٦ هەڵەیەکــی گەورەیە لە مێــژووی کــوردا کە هەردوولای لێ بەرپرسیارن و لە پلەی یەکەمدا مەسعود بەرزانی.
٥ ـ شەڕی برا کوژی لەنێوان هەردولادا، کە لە ٩٦٤ وە دەستی پێکرد و هەتــا ٩٩٧ بەشـێوەیەکی بچـڕ بچـڕ هەر بەردەوام بــوو گەورەتــرین و ترسناکترین هەڵەیە لە هەمــوو شۆڕشی کوردا و گەورەترین زیانیـدا لەو شۆڕشـە. لەم شەرەشـدا زیانمەنـدترین جەولە شـەڕی نەوەدەکـان بـوو کە هەلێکی لەکیسدا قەرەبوو ناکرێتەوە بۆ گەلی کورد.
٦ ـ شەشەمین هەڵەی کوشندە کە هەنگاوێکی زۆر گەورە بە خەباتی ڕزگــاری خــوازی ئەم گەلە چــووە دواوە ڕیفرانــدۆمەکەی ئەیلــولی ٢٠١٧ کە پارتی و یەکیەتی و یەکگرتووی ئیسلامی لێی بەرپرسیارن، زیاتر لە هەموشیان مەسعود بەرزانی کە دەستی پێکـردو سەرۆکایەتی کەیــسەکەی کــرد. بەو ڕیفرانــدۆمەش زیــانێکی زۆر گەورەی دا لەم میللەتە کە هەرگیز قەرەبوو ناکرێتەوە.

لە سایەی سیاســەتی حیزبایەتی تەسـک و قۆرخکردنی دەســەڵاتدا، واتە سیاســەتی دژ بە دیموکراســی، ســەرانی پــارتی و یەکیەتــی بــۆ نــزیکەی ٢٠ ســاڵ حکومڕانیــان کــرد بەبــێ هــیچ نۆپۆزســیۆنێکی پەرلەمانی، هەتا ئەوکاتەی ڕاپەڕینێ لە ناو ینکدا، بە سەرکردایەتی جێگری سکرتێری گشتی نەوشیروان مستەفا، بەرپا بوو بە پشتگیری

ژمارەیەکی زۆر لە گەنجانی ناڕازی لە سیاسەتی یەکیەتی و پارتی. زادەی ئەم ڕاپەڕینە دروستکردنی بزوتنەوەی گۆڕان بوو کە بەشداری کرد لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی ٢٠٠٩ داو نزیکەی چوار یەکی کورسیەکانی پەرلەمانی هەرێمی بەدەستهێنا. زۆرینەی سلێمانی و دەوروبەری دەنگیانداا بە گۆڕان، زۆرینەی دهۆکیش دەنگیان دا بە پارتی و هەولێریش نەیتوانی، لە ژێر دەسەڵاتی پارتیدا، بە ئازادی دەنگبدات. پارتی کە شێکی وەهای دروستکرد کە تای ترازوی پارتی قورستر بکات. لە لایەکی دیکە شەوە لەدوای هەڵبژاردنی ١٩٩٢ وە هەمیشە دوحیزبی حکومڕان، بە تایبەتی پارتی، پشتیان بە تەزویر بەستووە لە هەڵبژاردنەکاندا, جگە لەبەکار هێنانی دەسەڵاتداریتی و حیزبایەتی تەسک بۆ ڕاکیشانی دەنگی هاولاتیانی سادە. لەبەر ئەوە نەزانراوە دەنگی راستەقینەیان چەندە.

پارتی و یەکێتی لەم ٢٧ ساڵە دا بەردەوام بوون لە حکومڕانی بە ڕێڕەوی حیزبایەتی تەسک و لە گەندەڵکاری بە شێوەیەکی بەر بڵاوو ئاشکرا، بە لام ئەوگۆڕانکاریانەی بەسەر هەرێمدا هاتن، پاشی ڕزگار بوونی ٩٩١، بڕیاری دژە فڕین دژ بە سەدام، وەزعی کوردستانی گۆڕی و کەلە بەرێکی ڕاگەیاندنی لە حاڵ و ماڵی حکومرانانندا دروستکرد، بۆ یەکەمجار لە ڕاگەیاندنی ئۆپۆزسوێندا بەدەرچوونی ڕۆژنامەی ( هاوولاتی ) لە شاری سلێمانی . هەر لە سلێمانیشدا شتی وەها دەکرا پەیدا ببێ و لە هەولێر، لە ژێر دەسەلاتی بەرزانیدا، تا ئەم چرکەیەش شتی وەها نیە. دواتر گۆڤاری لڤین و ڕۆژنامەی ئاوێنە، دواتر تەلە ڤزوێنی گۆڕان، دواتر تەلەڤزوێنی ئین ئار تی. ئەوەی لەم دەزگایانەوە بڵاو دەکرانەوە دەگەیشتنە دهۆک و هەولیر هەموو دنیا، واتە پارتیشی دەپێکا. ئازادی ڕاگەیاندن هەموو پۆخڵەواتی پارتی و یەکیەتی فەزحکرد. ئەوەش هۆکاری بنەڕەتیە بۆ ئەو قەیرانەی کە

تێیــدا دەژیــن و ئەو باڵبــاڵێنە کە وەزعــی لێتــاڵکردوون و مانەوەیــانی خستۆتە ژێر هەڕەشەیەکی جدی. سەرانی ئەم دوحیزبە تا ئیستە هیچ دەرسێکیان لەم هەڵەو تێشکانە گەورانەیـان وەرنەگرتـووە کە لە سـاڵانی دوورو درێــژی کوردایەتیانــدا تێیکەوتــوون. پێیــانوایە کە پۆســتی سـەرکردایەتی ئەم هەرێـمە تـاپۆیە لەسـەر هەردوو بـنە مـاڵە و مـافی ڕەوای خۆیـانە وەک ڕژێمی پاشایەتی بە ئیرس حکومڕانی بڕوات لە باوکەوە بۆکوڕ و کوڕەزا.... هتد ئەگەر بە عەقڵ و لۆژیک بجووڵێن دەبێ واز لە قۆرخکردنی دەسەڵات و حیزبایەتی تەسک و کرداری دژ بە دیموکراسی و گەندەڵکاری و دژە شەفافیەت بێنن و بە شـیوەیەکی شارستانیانەو دیموکراسیانەی هـاوچەرخ، وەکـو خۆیـان دیویـانە لە وڵاتە دیموکراتیەکاندا، بجوڵێن، دیموکراسیانە مونافەسەی حیزب و ڕێخراوی سیاسی تر بکەن، ئەوە دوا ڕۆژی سیاسی خۆیان دەبەستن بە دوارۆژی گەلەکەیـانەوە. ئەگەر بە پـێچەوانەش بـێ بـێ گومـان ئەنجـامەکەی بەدڵی خۆیان نابێ.

# دەسپێکی قۆناغێکی نوێ لەبزووتنەوەی نەتەوەیی کورد

بەرلەوەی قسە لە سەر ئێستە و دوارۆژی کورد بکەین با ئاورێ لە مێژووی پێشووی بدەینەوە. کورد یەکێ لە چوار نەتەوە سەرەکیەکەی ئەم ناوچەیە بووە ( عەرەب، فارس، تورک، کورد ) عەرەب بۆ ماوەی ٦٠٠ سال ئیمپراتۆریەتی ئیسلامیان بەڕێوەبردووە، تورکیش بۆ نزیکەی ٥٠٠ ساڵ. فارسیش هەمیشە خاوەنی دەوڵەتی خۆیان بوون. بەڵام بە پێی مێژووی تۆمار کراو کورد قەت خاوەنی دەوڵەتی سەربەخۆ نەبوون. هەمیشە بەشبەش و داگیرکراو بوون. هێندێ ئەمارەتی کوردی پەیدا بوون کە دواینیان ئەمارەتی بابان بووە، بڕێتی بوون لە شێوەیەکی ئۆتۆنۆمی ئەو سەردەمانە. دەرکەوتنی هەستی نەتەوەیی هاوچەرخ بەشێوەیەکی سەرەتایی لە کتێبی (شەرەفنامەدا) ڕەچاو دەکرێ، لە شۆڕشەکانی شێخ سعید پیران لەسەدەی بیستەمەوە دژی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، شێخ محمودی حفید لە دوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە و کۆماری مە هاباد لە دوای جەنگی جیهانی دووەمەوە هەستی نەتەوەیی هاوچەرخ خۆی دەرخست. بەڵام تاکو کۆماری مەهابادیش دیاردەیەکی سروشتی بوو کە خەباتی ڕزگاریخوازی کورد بە سەرۆکایەتی ئاغایەک ( یان شێخێک یان مەلایەک ) بڕبابێ چونکە خەڵکی خوێندەوار هەرلە ناو ئەواندا هەبوون.

کۆتایی جەنگی جیهانی دووەم قۆناغێکی نوێی تۆمار کرد لە جوڵانەوەی ئازادیخوازی نەتەوەییدا. لەم قۆناغەدا سەرکردایەتی بزوتنەوەی کورد بە قۆرخکراوی نەما بوو بۆ شێخ و ئاغاکان، بەڵکو شێوازێکی نوێش لە سەرکردە پەیدا بوون نە کوڕە ئاغا بوون نە شێخ و مەلا بوون، بەڵکو لە توێژی ڕۆشنبیرانی هاوچەرخبوون. با سلیمانی و مهاباد بگرین بە نموونە. سلیمانی لە چلەکاندا سەرکردەی وەکو ڕەفیق حلمی بەخۆیەوە بینی کە ڕۆشنبیرێکی هاوچەرخ بوو، حیزبی هیوای دروستکرد، سەرکردەی وەکو

علی عبدللا و برایم احمد و جلال تاڵەبانی بەخۆیەوە بینی کە ڕۆشنبیری هاوچەرخبوون و پارتی دیموکراتی کوردستانیان دامەزراند، لە هەمانکاتدا مەلا مستەفای بەرزانی بینی کە شێخی عەشرەت بوو بەرلەوە ببێتە سەرۆکی پارتی و سەرۆکی نەتەوەیی. پاش زیاتر لە ۷۰ ساڵ تا ئەم چرکەیە، ئەوشێوەیە لە کۆماری مەهابادیش قازی محمد سەرکۆمار بوو حاجی بابا شێخیش سەرەکوەزیران بوو، مەلا مستەفاش یەکێ لە سەربازە سەرەکیەکانی بوو کە لە عێراقەوە چووبوو لە هەمان کاتدا کۆمەڵێ لە ڕۆشنبیرانی کوردی ڕۆژهەڵات و باشوور لە کایەدا بوون.

سەرکردایەتی شێوازی کۆن - عەشایەری - لەگەڵ سەرکردایەتی ڕۆشنبیرانی هاوچەرخ، کە بە هەردولایان سەرکردایەتی پارتییان پێکدەهێنا لەپاش شۆڕشی ١٤ تەموزی ١٩٥٨ وە بۆ ماوەیەکی کورت توانییان پێکەوە بە تەبایی کار بکەن، واتە لە ١٩٥٨ وە کە مەلا مستەفا لە یەکێتی سۆڤیەت گەڕایەوە بۆ ١٩٦٢. ڕاستەوخۆ لە دوای گەڕانەوەی مەلا مستەفا لە یەکێتی سۆڤیەت بۆ بەغدا سەرکردایەتی حشع ( حیزبی شیوعی عێراق )، کە ئەوکاتە گەورەترین حیزبی سیاسی عێراق بوو، بە کوردستانیشەوە، پێشنیازێکی پێشکەشی سەرکردایەتی پارتی کرد کە مەلا مستەفا دۆستی هەموان و برا گەورەیەکی ناحیزبی بێت. ئەمە بۆ خۆیشی و بۆ بەرژەوەندی کوردو هەموو عێراقیش باشترە. بەڵام سەرکردایەتی پارتی ئەمەی ڕەتکردەوە و دیارە خودی مەلا مستەفایش لەگەڵ ئەم پێشنیازە نەبوو.

مەلامستەفا بۆ ماوەیەك زیادە ڕەوی کرد لە مەدح و سەنای عبدالکریم قاسم لە لایەك و هێرشکرنە سەر حسع و هاندان لە دژی لە لایەکی دیکە. ئەمەش لەکاتێدا کە دوای ١٤ تموز هاوپەیمانیەك واژۆکرابوو لەنێوان حشع و پارتیدا، بەرژەوەندی هەردوولا لەوەدابوو کە هەولی جێبەجێکردنی بدەن. بەلام هەلوێشتی توندی بەرزانی بوو بە کۆسب لەرێگەی هاوکاریدا.

# خەباتی چەکداری لە ١٩٦١ دا هەڵەیەکی ستراتیجی گەورە بوو

لە ١٩٦١دا ڕووداوێ هاتە ئارا کە کاریگەریەکی قووڵی بە جێهێشت لەسەر ئاییندەی عێراق بەگشتی و کوردستان بە تایبەتی – ئەوە هەڵگرتنی چەك بوو لەلایەن پارتیەوە دژی ڕژێمی نیشتمانی کۆریە کەلە ١٤ تەموزی ١٩٥٨دا لەدایکبوو بەسەرکردایەتی ئەفسەری نیشتمان پەروەر قاسم. ئائیستە بڕیارێکی سەرکردایەتی پارتیم نەدیوە سەبارەت بە دەستپێکردنی خەباتی چەکداری بۆ جێبەجێکردنی فلانە ئامانج. بەگومانم کە بڕیارێکی لەم چەشنە هەبێ. کاك مسعود لە کتێبە کەیدا بەڕاشکاوی نوسیویتی کە هەڵگرتنی چەك دژی قاسم هەڵەبوو. ئەم ڕایەم لە هەندێ سەرکردەی دیکەیشی پارتی بیستووە. بەڵام هەموو ئەم دانپێدانانە درەنگ هات. من ١٩٦٦دا لە کۆچکردوو یوسف حەننام بیست کە لە دانیشتنێکدا (سەرەک عەشرەتی ئاکۆ عباس مامەند وتی : ئێمە _ ئاغاکان _ هێندێ تەقوتۆقمان سازکرد بۆ ترساندنی حکومەت بەشکو واز لە دابەشکردنی زەویەکانمان بێنن، پارتی هاتوو کردی بە شۆڕشی خۆی).

ڕای شەخسی من ئەوەیە کە دەزگای هەواڵگری بەریتانیا، کەلە هەموو دەوڵەتێکی دیکە زەرەرمەنتر بوو بە هۆی شۆڕشی ١٤ تموزەوە، توانی بە شێوەیەک لە شێوەکان پارتی تێوە بگلێنێ بێ ئەوەی ئاگای لە خۆیبێ. ئامانج لەم شەڕەش لاواز کردن و ڕووخاندنی ڕژێمی قاسم بوو - ئەمە جێبەجێ کرا بە کودەتای ٨ شوباتی ١٩٦٣ کە بەریتانیا و ئەمریکاو جمال عبدالناصر لە پشتەوە بوون و لێدانی بزوتنەوەی کۆمۆنیستی ئامانجێکی سەرەکی ئیمپرالیستەکان بوو. باڵی مەکتەبی سیاسی پارتی بە سەرۆکایەتی ابراهیم احمد بە حەماسەوە چوو بە پیر خەباتی چەکداریەوە. بەڵام پێموایە ئەوپرۆژەیە سەرینەدەگرت ئەگەر

مەلا مستەفا قبولّی نەکردایە. بەھەرحاڵ بۆ ئەم پرسە شایستەی مشتومڕو لێدوانە : دەستپێکردنی خەباتی چەکداری کورد دژی ڕژێمی قاسم لە جێگەی خۆیدا بوو؟ کارێکی دروستبوو؟ من بەھەڵەی دەزانم لەو کاتەدا، لەبەر ئەم ھۆکارانەی خوارەوە :

- لە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقەوە ( ١٩٢٠ ) قدت سەرەکوەزیر بۆ عێراق دانەنراوە بێ ڕەزامەندی باڵوێزی بەریتانی. لە تەمموزی ١٩٥٨ دا قاسم ئەم وەزعەی سەرەو ژێرکرد، عێراقی لە ئیمپرالیزم ڕزگار کرد، بۆ یەکەم جار حکومەتێکی نیشتمانی خاوێن دا مەزرێنرا، عێراق لە ھاوپەیمانی بەغدا ـ کە پاشکۆی ناتۆ بوو ـ دەرھێنرا، قاسم یاسای چاکسازی کشتوکاڵی دەرکردو ڕژێمی دەرەبەگی ھەڵوەشێنرا، دەستورێکی کاتی داڕێژرا کە پرنسیپی ( شەراکەتی کورد و عەرەب ) ی تێدا داڕێژرا، کۆمەڵێ کاری باش کرا. پارتی بەھیچ شێوەیەک، لە سەردەمی پاشایەتیدا، نزیکەی ٤٠ ساڵ نە بیری لە خەباتی چەکداری کردبووە نەداوای شتێکی زۆر لەوە کەمتریش کردبوو. تەنھا ٣ ساڵ بەسەر ١٤ تەموزدا تێپەڕیبوو کە چەکی دژ بە قاسم ھەڵگرت. ئەمە بە ھیچ پێوەرێکی لۆژیکی پاساوی نەبوو. دەبوو شانسی بدرایە بە قاسم، کوشاری سیاسی و جەماوەری بخرایەتە سەری لە پێناوی دیموکراتیزە و ھەڵبژاردنی پەرلەماندا ( کە قاسم بیناکەشی بۆ دروستکردبوو ). من دوپاتی دەکەمەوە کە پارتی، بێ ئەوەی ئاگای لە خۆی بێ، یان بە ئاگاو زانیاری تەواوەوە، بەم چەکھەڵگرتنە ڕاکێشرایە نێو پرۆژەی کاری ئیمپرالیستەکان بۆ ڕووخاندنی ڕژێمی قاسم. ئەمەش ھەڵەیەکی ستراتیژی مێژوویی بوو کە ئاسەواری خراپی بە درێژەی ٦٠ ساڵی ڕابوردوو ھەتا ئێستە دەبینرێ. ئەمە و تەمەنی ڕژێمەکەی تەموز ھێشتا ٣ ساڵ بوو. ئەم چەکھەڵگرتنە ناوەختە ڕژێمی قاسمی لاوازکرد و بە بەرژەوەندی ئیمپرالیزمی بەریتانی ـ ئەمریکی

شکایەوە، کەشێکی باشی خولقاند بۆ گرێدانی هاوپەیمانی لە نێوان پارتی و حیزبی بەعسی عەفلەقیدا کە بە تاوانی کۆدەتای ۱۹٦۳ کۆتایی هات. ئەمە بەرپرسیارییە تێکی گەورە دەخاتە ئەشتۆی سەرکردایەتی پارتی بە هەردوو باڵە کەیەوە. دەبێ ئامارە بۆ ئەوەش بکرێ کە پارتی هیچ کەڵکێکی لەم هاوپەیمانیتیە لەگەڵ بەعس بەدەستنە هێنا، بەڵکو شکایەوە بە زەرەری زۆربەسەرمیللەتی کوردو هەموو عێراق و خودی پارتیشدا.

## خیلافاتی بارزانی و مەکتەبی سیاسی بوو بە لەتبوون

بێینەوە سەر کێشەی سەرکردایەتی لە نێو پارتیدا، خلافاتی نێوان مەلا مستەفا و مەکتەبی سیاسی بە سەرۆکایەتی برایم احمد، لە پاش دەستپێکردنی شەڕی چەکداری دژبە ڕژێمی عێراق، هەر لەزیادبوندا بوو. لە ١٩٦٣ دا لە زۆر ڕووەوە دابڕابوون لە یەکتر، وەکو دوو ڕێخراوی جیا لە یەکتر دەجولان. لە ١٩٦٤ گەیشتە تەقینەوە و پێکدادان و چەکدارانی مەلا مستەفا سەرکەوتن و مەکتەبی سیاسی بەسەرکردە و بنکەوە کوردستانی عێراقیان جێهێشت و گەیشتنە هەمەدان، بەسەرپەرشتی ساواک ( ئێستە ناو دەبرێ بە ئیتلاعات ) بۆ ماوەی ساڵێک مانەوە. زۆربەی کادری حیزبی لەگەڵ مەکتەبی سیاسی ڕۆیشتن و کەمیان لەگەڵ مەلا مستەفا مانەوە:

مەلا مستەفا ناچار بوو، پاش ڕاونانی مەکتەبی سیاسی بۆ ئێران، هەوڵی بنیاتنانەوەی پارتی بدات.

حبیب محمد کریم کرا بە سکرتێرو چەند کەسێکی تازەی دیاری کرد کە کەسی لە سەرکردایەتی هەڵبژێراوی پێشووی تێدا نەبوو. ئاستی فیکری – سیاسی سەرکردایەتی پارتی زۆر دابەزی، بەڵام مەلامستەفا گوێیی لە شتی وەها نەبوو چونکە حیزب بەلای ئەوەوە وەکو تیرەیەکی عەشرەت سەیر دەکرا. خۆی بەشداری نەدەکرد لە کۆبوونەوەی حیزبیدا. مەکتەبی سیاسی یان کۆمیتەی مەرکەزی بەبێ ئەو کۆدەبوونەوە و پاشتر یەکێ یان زێتر بە بڕیارەکانەوە دەچونە لای بۆیان دەخوێندەوە یان بە دەمی پێیان دەوت و ئەو بڕیارەی بچوایەتە عەقڵی وەردەگیرا و ئەوەی نەچوایەتە عەقڵی مردار دەکرایەوە.

# هاوکاری پارتی لەگەڵ کودەتاچیەکانی حیزبی بەعس -١٩٦٣

لە چلەکانەوە تا شەستەکانی سەدەی بیستەم حشع بەهێزترین حیزبی سیاسی بوو لەسەر ئاستی هەموو عێراق و جگە لە حشع و پارتی، کە نوێنەری بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد بوو، حیزبیتر لە کوردستانی عێراقدا نە بوو. حشع دژی چەکهەڵگرتنی پارتی بوو لەو کاتەدا، بە تایبەتی سکرتێری حیزب شەهید سلام عادل هەوڵی زۆری دا لەگەڵ پارتی کەواز لە چەک بێنن، بەڵام بێهودە بوو. سەرکردایەتی پارتی داوای لە حشع دەکرد چەک هەڵگرێ.

لەورۆژانەدا خودی پارتی توانای شتێکی گرنگی نەبوو دژبە ڕژێمی قاسم. بەڵام هەڵگرتنی چەک لە کوردستاندا کارئاسانیەکی زۆری پێشکەش دەکرد بە دوژمنانی قاسم کە بەرەیەکی بەهێز بوون، پێکهاتبوون لە بەریتانیا و ئەمریکا و عبدالناسر و حیزبی بەعسی عفلقی عێراق و کۆمەڵێ لە ئەفسەری پلەبەرزی سوپای عێراق. دوژمنایەتی قاسم و حشع ئەمانەی کۆکردبۆوە لەیەک بەرەدا. قاسم خۆیشی ئەوی بیری لێنەکردبێتەوە کۆدەتای دژ بە ڕژێمەکەیبوو، گومرابوو، زۆر ڕازی بوو لە خۆی، قەت ڕاوێژکاری سیاسی نەبوو. ئەگەر تۆزێ ترسی هەبووبێ تەنها لە حشع دەترسا کە کورسیەکەی لێزەوت بکات، ئەمە لەکاتێدا کە حشع بەوپەڕی دڵسۆزیەوە هەر زانیارییەکی دەستکەوتایە بە بەرنامە بۆیدەنارد لەسەرچالاکی بەعس و ئەفسەرە دژەکانی، ئەویش ئەو ئەفسەرانەی بانگدەکردە لای خۆی و نامە کانی نیشاندەدان، پێیدەوتن : ( ئەمە حشع بۆیناردووم )، وایدەزانی بەم کارە ئەو ئەفسەرانە دەکات بە دۆستی خۆی و دوژمنی حشع بە تەنها. قاسم دەیتوانی ڕژێمەکەی خۆی بپارێزێ، بەڵام گومڕا و

نەزانبوو، لەبەر ئەوە بەکۆدەتای ٨ شوباتی ١٩٦٣ ڕووخێنرا و شەهیدیش کرا لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە ئەفسەرە دڵسۆزەکانیدا.

حشع کەردستەی بەرەنگاربوونەوەی هەبوو. بەپێی ڕاپۆرتی کۆمیتەی حیزب تایبەت بە ڕێخراوی نێو سوپا لە هاوینی ١٩٦٢ هێشتا ٢٥٠ ئەفسەرو ٥٠٠ سەربازی خەتدار ئەندامی حیزب بوون لە ڕیزەکانی سوپادا، کە یەکێکیان سەرکردەی هێزی ئاسمانی جلال ئەوقاتی بوو، یەکێدی بەرپرسی کەتیبەی مدرعات خزعل السعدی بوو. بەڵام دەستێوەردانی بەپەلەی ستالینیستەکانی سەرکردایەتی حیزبی شیوعی سۆفێتی، ڕاستەوخۆ پاش خۆپیشاندانە ملیونیەکەی نایاری ١٩٥٩ سەری لە حشع تێکدا و پرسی هەموو شێوەیەک لە بەرەنگاربوونەوەی کۆدە تای سەربازی دژ بە ڕژێم سڕیەوە. لەبەر ئەوە حشع نەیتوانی هیچ یەکەیەکی سەربازی بجوڵێنێ دژ بە کودە تاکە. ( باسی ئەم دەست تێوەردانەم لە جەڵدی یەکەمی بیرەوەریەکانمدا کردووە ( لاپەڕە ) چاپی ١٩٩٦ لە هەولێر ).

حشع بە حەزی خۆی چەکی لە کوردستان هەڵنەگرت دژی ڕژێمی قاسم، بەڵام خودی ژیان و بەسەرهاتەکانی ناچاریان کرد کەبێ دیراسەو بڕیاری سەرکردایەتی ناچار بوو بە یاخی بوون و چەکهەڵگرتن بەمەبەستی بەرگری لە خۆکردن دژی بەعسی فاشستی کە لەورۆژانەدا دەوروبەری.( ٥ ) هەزاری لێکوشتن، بە سکرتێر ٩ ئەندامی مەکتەبی سیاسی و کۆمیتەی ناوەندیشەوە.

گومان لەوەدا نیە کە جێگەی لەبارتر بۆ خەباتی چەکداری لە عێراقدا شاخەکانی کوردستانە. هەر شیوعیەک لە کوردستاندا توانی بە خۆی و چەکەکەیەوە رایکرد بۆ شاخ. لەو ڕۆژەدا بەرژەوەندی گەلی کوردو خودی پارتیش هەرلەوەدا بوو کەپارتی پێشوازی برایانەی گەرم لە شیوعیەکان بکات و بڵێ : ئێستە لەم شاخانەدا دەتوانین بەرە لەگەڵ

نێوە دروست بکەین. بەڵام برایم احمد هەڵەیەکی گەورەی کرد کە هەڵوێستێکی دوژمنکارانەی ڕاگەیاند و باڵی مەکتەبی سیاسی هەر شیوعیەکی بەچەکەوە بگرتایە چەکی دەکرد، با لە ڕێگەی شەڕو کوشتنیشەوە بوایە، وەکو لە چیای بەمۆ ڕوویدا و ( ١١ ) لە شیوعیە کانیان کوشت و بریندار کرد.هەروەها لە وڵەسمت و...هتد. ئەمە هەڵوێستێکی نەتەوەیی وشک و تێژ بوو، جۆرێ لە تۆڵەکردنەوە لە حشع لە سەر ئەوە کە لە وەوپێش جموجوڵی بە ئارەزوی پارتی نەبوو.

برایم احمد و مەکتەبی سیاسی لەو ڕاستیە نەدەگەیشتن، یان بە عەمدی نەیدەویست تێبگات، کە یەکگرتنی ئەو دوو حیزبە ( پارتی و شیوعی ) مانای یەکگرتنی هەموو هێزی سیاسی نیشتمانی ئەم بەشەی کوردستانە و ڕاکێشانی بەهێزترین حیزبی سیاسی نیشتمانی عێراقیشە بۆ پاڵپشتی خەباتی ئازادی خوازی کورد. بە پێچەوانەی برایم احمد مەلامستەفا بە خۆشحاڵیەوە پێشوازی لەو شیوعیانە کرد کەچوونە لای و خستنیە ناو پێشمەرگەکانی، ئەگەرچی پرسی بەرە لای ئەویش بابەتی باس نەبوو. دەبێ ئەوەش بوترێ کە کەسایەتی دووەمی باڵی مەکتەبی سیاسی جلال تالەبانی، کە سەرۆکایەتی شاندی دانوستانی پارتی دەکرد لەگەڵ بەعسیەکان، چەند کەسێکی شیوعی لە بەغداوە گواستەوە بۆ کوردستان، ڕزگاری کردن لە بەعس و کوشتن.

# هاوکاری پارتی لەگەڵ کودەتاچیانی ١٩٦٢
# هیچ کەڵکێکی بۆ کورد نەبوو

هاوکاری بزوتنەوەی نەتەوەیی چەکداری کورد _ پارتی _ لەگەڵ دوژمنـانی قاسم کەڵکێکـی زۆری بەخـشی بە کودەتاچیەکـانی ٨ شـوبات، ئیمپرالیـستەکان لە لەنـدەن و واشـنتۆن سـەرکەوتوو بـوون لە ناراستەکردنی گـوررێکی کوشندە لە رژێمی نیشتمانی قاسم کە ئەمە ئامانجی سـەرەکیان بوو لەو رۆژانەدا، حیزبی بەعـسیان خستە جێگەی قاسم و ئەو ئەرکە فاشیـستیەیان خـستە ئەسـتۆیان کە قاسـمیەکان و شیوعیەکانی عێراق قەلاچۆ بکەن و هەوڵی سڕینەوەی دەسکەتەکانی شۆڕشی ١٤ تەمووز بدەن. پارتیش بەتەما بوو وەکو بەشداریێ لە بەرەی کودەتاچیەکاندا کۆمەڵێ دەستکەوتی گرنگی پێببرێ، بەڵام هیچی دەستنەکەوت. بەعسیەکان بۆماوەیەک پشی پشییان لەگەڵ کردن و بە وەعـدو وعـودی درۆ خەڵەتانیانـدن. بەڵام لە کۆتاییـدا کـورد هیچـی دەستنەکەوت، بەڵکـو حاڵیـان زۆر لە سـەردەمی قاسم خراپتر بـوو. بەم شێوەیە بینیمان چۆن دەستکردن بە خەباتی چەکداری لە ئەیلولی ١٩٦١ دا هەڵەیەکی ستراتیجی گەورە بوو بۆ پارتی، هاوکاریەکەی ١٩٦٣ یش لەگەڵ بەرەی دژ بە قاسم هەڵەیەکی گەورە تر بوو، زیانی گەورەیدا لە بەرژەوەندی گەلی کورد و هەموو گەلانی عێراق.

کۆدەتای شوبات دابڕاوبوو لە جەماوەری عێراق، بە پێچەوانەی شۆڕشی ١٤ تەمـووز، بەعـسیەکان خۆیـان نە لەنـاو جەمـاوەردا هێـزو تونـایەکی وەهایـان نەبـوو کە بتـوانن پشتی پێببەسـتن، نە ڕێخراوی حیزبـی — نە سـەربازیان هەبـوو کە بەراوردبکرێ لەگەڵ ڕێخراوی حیزبی — سـەبازی حشع لەنـاو سـوپای عێراقدا. بەهـیچ جۆرێ بەعـسیەکان نەیانـدەتوانی لەوکاتەدا کۆدەتای سەربازی جێبەجێکەن بەبێ ئەم دوو خاڵەی خوارەوە :

١- هاوکاری کۆمەڵێ لە ئەفسەرانی گەورە و مامناوەنجی سوپای عێراق کە هێندێکیان لە خزمەتدابوون و هێندێکیش خانەنشینکرابوون و بەشداربوون لە جێبەجێکردنی کودەتاکەدا، ڕۆڵی خۆیان بۆ دیاری کرابوو.

٢- ئەزموون و پارەی زۆریان خرابوە بەردەست. هەردوو دەوڵەتی بەریتانیا و ئەمریکا ئەزموونی دەیەها کۆدەتای سەربازییان هەبوو لە ئاسیاو ئەفریقا و ئەمریکای باشوور.

سەرەڕای ئەمانەش قاسم ئەزموونی سیاسی کەمبوو، وایدەزانی عێراق هەر ئەوەی ١٩٥٨ کە ٪٩٠ ی ئەو خەڵکە دەیانپەرست و نەیدەزانی کە پێنج ساڵ لە ڕەفتاری سەربازی بیروکراتیانەی خۆی ولە پڕو پاگەندەی دوژمنان کاریگەری خۆی لە گۆڕەپانی سیاسی وڵاتدا جێهێشتووە. تا کار لە کار نەترازا قەناعەتی وەهانەبوو کە کۆدەتاکە سەردەکەوێ، فەرمانی دەرنەکرد چەک بەسەر پشتیوانانیدا دابەشکرێ، داوای نەکرد لە یەکینە سەربازیەکانی سەربەرژێمەکەی بجوڵێن....هتد لەلایەکی دیکەشەوە، لەو ڕۆژەوە ( لە ئەیاری ١٩٥٩ وە ) کە سەرکردایەتی ستالینی یەکێتی سۆڤیت دەستی خستە نێوکاری حشع و بڕیارەکەی خۆی پێهەڵوەشانەوە. بەڵێ لەو ڕۆژەوە شیوعیەکانی عێراق سەریان لێشێوا چونکە بە قەناعەتی لایەکیتر، نەک هی خۆیان، ئەو هەڵوێستەیان لە ئەستۆگرت.

# ڕوخانی ڕژێمی بەعس لەتشرینی ١٩٦٣ دا

جگە لەوەستاندنی شەڕلە کوردستاندا، پاش کۆدەتاکە، کە ڕۆژانی دانوستان بوو، پارتی بەهەردوو باڵەکەیەوە هیچ بەروبوومێکی لە سەرکەوتنی کۆدەتاکە دەستنەکەوت بۆ گەل و نیشتمانی کورد یان بۆ خودی حیزبەکەشی، لەلایەکی دیکەوە هیچ باشبوونێ نەکەوتە نێوان هەردوو باڵەکەی حیزبەوە، بە پێچەوانەوە، چۆن پارتی پڕبوو لە ناتەبایی و کێشەی ناوخۆیی، هەروەها حیزبی هاوپەیمانیش – حیزبی بەعس – پڕبوو لە ناتەبایی و کێشەی ناوخۆیی و لە پایزدا هەوڵیدا لە ڕێگەی کۆبوونەوەوە چارە سەری بکات هەتا هاوپەیمانە نەفسەرەکانی ئەومیان بە هەل زانی و لە چرکەیەکدا – ١٨ تشرینی ١٩٦٣ – یەکینە سەربازیەکانیان جووڵاند دژ بەومیلیشیایەی حیزبی بەعس دروستیکردبووبەناوی ( حەرەس سەورە ) ( وەکو نێس نێسی هیتلەر ). میلیشیا چەککرا، کە زێتر جێگەی باوەڕی ئەو حیزبە بوو، لە دەسەڵات دەرکراو هەموو دەسەڵاتەکان لە دەستی سەرکۆمار ( عبدالسلام سلام عارف )دا کۆبوونەوە. هاوڵاتیانی هەموو عێراق، بە کوردیشەوە، خۆشحاڵیان دەربڕی بە دوورخستنەوەی بەعسیەکان و هەڵوەشانەوەی میلیشیا فاشیەکان، بەو هیوایە کە شێوازی مامەڵەی حکومەت لەگەڵ هاووڵاتیان بگۆڕدرێ. بەڵام لەو ساڵ و نیوەدا کە لەسەر کورسیەکەی مایەوە عبد السلام هەر وەکو دکتاتۆرێکی سەربازی و تیرۆرست وڵاتی بەڕێوە بردوو دەیەها کەسیتری لە قاسمیەکان و لە شیوعیەکان ئیعدام کردو ( زعیم سدیقی ) وەکو تیرۆرستێکی دڕندە بەردایە گوندنشینەکانی کوردستان.

پاش ماوەیەکی کورت لەکۆدەتاکەی شوباتی ١٩٦٣ شەڕ لە نێوان پارتی و ڕژێمی بەعسدا دەستی پێکردەوە. دوای ڕووخانی بەعسیش عبد السلام عارف بەردەوام بوو لەسەر شەڕەکە هەتا فڕۆکەکەی لە نیسانی ١٩٦٥ دا کەوتە خوارەوە و خۆیشی تێدا سووتا. وەکو لە کۆمەڵگای خێڵەکیدا باوە عبدالرحمن ی برای کرا بە سەرکۆمارو چووە جێگەی، کە ئەویش بە پلەی لیوا بوو لە سوپادا. بەڵام عبدالرحمن جیاوازی لەگەڵ براکەی هەبوو، هێمن تر بوو حەزی لە کوشتن و بڕین نەبوو، دیارە هیچ ئەزموونێکی سیاسیشی نەبوو.

# شەڕی هەندرێن بەهێزترین گورز بوو لەسوپای عێراق

پاش وەرگرتنـی پۆستەکەی بە چەنـدڕۆژێ، لە ئەیـاری ١٩٦٥دا شەو بەشێ لە سوپاوجاشەکان لەسەربازگەی ڕواندزەوە دزەیان کردبوو بۆ سەرشاخی هەنـدرێن کە مەلامستەفا پاراستنی سپاردبوو بە پێشمەرگە شیوعیەکان. ئەمە سەرکەوتنێکی گرنـگ بـوو بۆ حکـومەت. بەڵام لە ١٢ ئەیاردا پێشمەرگەکانی حشع و سریە یەک پێشمەرگەی دۆستیان کە عیزەتی سلێمان بەگی دەرگەڵە سەرکردایەتی دەکردن هێرشیان بردە سەر ئەوهێزە کە دزەی کردبـوو بۆ سەرشاخەکە. هێزەکە شکاو ڕاونـرا تاسەربازگەی ڕەواندوز. لە مێژووی خەبـاتی چەکداری کوردستاندا تـا ئەو چرکەیە ئەمە گەورەترین سەرکەوتنی سەربازی بوو دژی حکـومەت، بـوویش بە هۆکـار بـۆ واژۆ کردنـی ئاگربەسـی ٢٩ حـوزەیرانی ١٩٦٦. کاتی واژۆکردنی ڕێکەوتـنەکە تـاقمی مەکتەبی سیاسی ڕێکەوتبوون لەگەڵ بەغـداو لە شـەڕدا بـوون لەگەڵ پێـشمەرگەدا. بێگومـان مەلامستەفا لەو ڕێکەوتـنەدا حسابی بۆ ئەو پرسە کردبـوو، دەیویـست شەڕەکە چڕبکات دژ بە چەکدارەکانی مەکتەبی سیاسی. لەبەر ئەمە زۆری مەبەست نەبوو کە ناوەڕۆکی ڕێکەوتن شتی گرنگی تێدا نەبێ بـۆ چارەسـەری کێـشەی کـورد، سـەبارەت بە عبـدالرحمن عـارفیش شەڕەکەی هەندرێن بەجدی ترساندی و ناچاری کرد بە ئاگر بەس.

## کودەتای دووەمی بەعس بەسەرپەرشتی ڕاستەوخۆی cia جێبەجێکرا

پرسی کودەتای سەربازی لە عێراقدا بابەتی باسبوو لە نێوان لەندەن و واشنتۆندا، بەتایبەتی پاش مردنی عبدالسلام و جێگرتنەوەی لەلایەن عبدالرحمن ی برایەوە، لەساڵی خوێندنی ١٩٦٧دا هەڵبژاردنی سەندیکای خوێندکارانی زانکۆی بەغداد کراو خوێندکارانی سەربە حشع زۆرینەی دەنگیان لە زانکۆدا بەدەستهێنا. ئەم سەرکەوتنە گەورەیە بۆ چەپەکان، سەرەڕای ئەوهەموو تیرۆرو کوشتارەش لەڕۆژانی کودەتا فاشیەکەی شوباتی ١٩٦٣دا، زەنگی مەترسی بوو بۆ ئیستیعمارو نۆکەرانی، کەوتنە گفتوگۆو بە پەلەپەل بۆسازکردنی کۆدەتایەکی تازە، بەتایبەتی ئەوەشیان لا ڕوون بوو کە هێشتا حشع زۆر زۆر لە حیزبی بەعس جەماوەریترە.

عبدالرحمن عارف وەکو خۆی ئەزموونی سیاسی نەبوو پێناچێ ڕاوێژکاری سیاسی و هەواڵگری جدیشی هەبووبێ. دیارە هیچ مەترسیەکی لەکۆدەتای سەربازی نەبوو. لە هاوینی ١٩٦٨دا نێردراوی ئەمریکی راونتری سەردانی بەغدادی کردو بڕگەیەکی جەوهەری سەردانەکانی چاوپێکەوتنی احمد حسن البکر بوو کەوەکو سەرۆکێکی حیزبی بەعس تەماشای دەکرا. دواییش وەها بڵاوبۆوە کە ئەو دانیشتنە بۆ باسی ئەو کۆدەتایە بووە، واتە بۆ دوایین تاوتوێی ئەو کۆدەتایەی کە ١٧ تەمموزی ١٩٦٨جێبەجێ کراوبەعسیەکانی گێڕایەوە سەرکورسی دەسەڵات.

بەعسیەکان دەیانزانی کە لە ناو جەماوەردا بوغزێنراون و دەستدرێژی و تاوانەکانی ڕۆژانی ١٩٦٣ یان لەبیری ئەو خەڵکە نەچووە. لە کوردستانیشدا ئەمجارە پارتیان لەگەڵ نەبوو. بۆیە هەرلەسەرەتاوە بڕیاریان دابوو، یان هێندێ هەواڵگری دەرەوە ئامۆژگاری کردبوون، کە

هەوڵبدەن هەویەی خۆیان ئاشکرا نەکەن تا جێپێی خۆیان قایمنەکەن، وشەی ( بەعس ) لە هیچ ئامێرێکی ڕاگەیاندن نەبیسترا تا چەند ڕۆژێک. بەڵام پاشتر، لەگەڵ ڕووبەڕوو بوونەوەی یەکەم تاقیکردنەوەدا هەرناوەکەیان نەناسرا بەڵکو سروشتی سیاسی ڕاستەقینەشیان ناسرا.ئەوە بوو کرێکارانی کارگەی ڕۆن لە بەغدا، پاش چەند ڕۆژێ لە کودەتاکە، مانگرتنەکەیان ڕاگەیاند بۆ هێندێ داخوازی پیشەیی خۆیان. سەدام حسین تکریتی مانگرتنەکەی نوقمی خوێن کردو هەڕەشەی زۆریشی کرد. پێویست بە بەڵگەی زێتر نەبوو کەئەمە هەر ڕژێمە فاشیەکەی بەعسی ١٩٦٣یە. بەڵام ڕاگەیاندنی فەرمی ڕژێمی نوێ بەردەوام بوو لە هەوڵی خۆیدا بەشکو بە خەڵکی بسەلمێنێ کە ئەم کودەتایەی ئێستە وەکو ئەوەی شوباتی ١٩٦٣ نیەو ئەمجارە بە عەقڵێکی ترەوە هاتوون و ناگەڕێنەوە سەر ڕەوشتی پێشوویان. کەمێ لە خەڵک باوەڕی پێدەکردن و زۆرینە بە ترس و گومانەوە تەماشای دەکردن.

لە ١٩٦٨دا، کە کودەتای دووەمی حیزبی بەعس جێبەجێکرا، بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد لە دوڕیانێکی ئالۆزو پڕ لەگرێدا بوو. ئەم بزوتنەوەیە لەنێوان خۆیدا لەت بوو بوو، شەڕی ناوخۆی کوردی ( شەڕی براکوژی ) هەڵگیرساندبوو، لایەکی بەشاخەوە بوو لایەکەی تریشی لە شاردا، لەگەڵ حکومەتی عێراق یەک بەرەبوو. باڵی مەکتەبی سیاسی بەسەرکردایەتی برایم احمد چەکوتەقەمەنی و پوول و پارەو بارەگای پابین.. هتد بۆ دابین کرابوو هەتا بتوانێ شەڕ بکات دژی پێشمەرگە و ئەگەر لە شەڕێکیشدا شکا دەگەڕێتەوە بۆ قوڵایی ستراتیجی خۆیی ( بۆ لای حکومەت ) بۆ ئەوەی پشوو بدات و خۆی کۆبکاتەوە بۆ هێرشێکی دیکە. لەلایەکی دیکەوە سەرکردایەتی پێشمەرگە لەگەڵ حکومەتی عبدالرحمن عارف ئاگربەستی بەستبوو، سەرگەرمی شەڕبوو دژی باڵی مەکتەبی سیاسی. ئەمیش ئەگەر لە شەڕێکدا بشکایە

ئەختێ پاشەکشەی دەکردو سەنگەری دەگرت بێ ترس و دەکەوتە ئامادەکاری بۆ جێبەجێکردنی هێرشێکی تۆڵە ئامێز. نازانم ڕێکەوتنامەی ئاگربەس لەگەڵ بەغدا چی نهێنی لەگەڵ بوو، چیان لە بەغدا وەرگرت، بەڵام ئەوە نهێنی نەبوو کە پێوەندی سەرکردایەتی خەباتی چەکداری لەگەڵ تاران، پاش ئاگربەسیش، وەکو خۆی مابوو.

حکومەتی تازەی بەعس هەردوو ڕێکەوتنەکەی قبوولکردو، لانی کەم لەسەرەتاوە هیچ گۆڕانکاریەکی تێدانەکرد. ئەرکی هەرەپەلەی دەسەڵاتی نوێ پتەوکردنی پێگەی خۆی بوو لەکۆمەڵگەدا. جگە لەمەش ژمارەیەک لە ئەندامانی سەرکردایەتی حیزبی بەعس بەجدی دەیانویست هێندێ چاکسازی لە حیزبی بەعس و هێڵی سیاسیدا بکەن، یان پێیانوابوو ئەمە دەکرێ لەکاتێدا کە دەسەڵاتیان لەدەستدانەبوو. کەهاتنە سەر دەسەڵاتیش سەدام یەک بە یەکیانی کوشت دوسێ کاسەلێس نەبێ وەکو تەها یاسین ڕەمەزان و تاریق عەزیزو عیزەت دووری. خۆی بەتەنها وەکو دکتاتۆرێکی بێوێنە ٣٥ ساڵ حوکمی کرد هەتا ئەمریکا ڕووخانی و شیعەکان هەڵیان واسی.

## بەیانی ١١ ی ئازاری ١٩٧٠ تێروتەسەلترین بەڵگەنامەی مافی کورد بوو لەو سەردەمەدا

تاقمی مەکتەبی سیاسی بۆ چوار ساڵی رەبەق مانەوە لەگەڵ حکومەتی عبدالرحمن عارف و بەعسی سەدامی ( ١٩٦٦ – ١٩٧٠ ) هەتا سەدام رێکەوتنی ١١ ئازاری ١٩٧٠ ی لەگەڵ بەرزانی واژۆکردو ئەوان، زەلیلتر لەهاتنەوەکەی ١٩٦٥، بۆجاری دووەم لە بەغداوە هاتنەوە و خۆیان رادەستی بەرزانی کرد، جگە لە سکرتێرەکەیان برایم ئەحمد کەپاش کۆنفرانسی تیمار ( قەرەداغ ) عێراقی جێهێشت و ژیانی پەنابەری لە بەریتانیا هەڵبژارد.

لەسەرەتای دەسپێکی خەباتی چەکداریەوە – ئەیلولی ١٩٦١ - هەتا راگەیاندنی رێکەوتنی ١١ ئازاری ٩٧٠ ئەورێکەوتنە تێروتەسەلترین بەڵگەنامەبووە کە بەروونی کۆمەڵێ داخوازی گەلی کوردستانی عێراقی لەخۆگرتبوو. سەدام دانی بەوەدا ناوە کەپاشەکشەی زۆری کردووە بەرانبەری بەرزانی. بەوەش ئەو پاشەکشەیە پاساو دەدات کە چەک و تەقەمەنی نەمابوو، توانای بەردەوامی لەسەر شەڕ نەمابوو. بەڵام من بەگومانم کەسەدام راستبکات چونکە واشنتۆن و لەندەن پشتگیریان دەکردو دەیانتوانی چەکیشی بدەنێ. لێرەدا، ئەوگریمانەش دادەنێم کەلەمێشکی خۆیدا سەدام گەڵاڵەی ئەوپرۆژەی کردبوو کەلە ٩٧١ دا دەرکەوت بۆ کوشتنی مەلا مستەفا. ئەوکێشەی سەرەکی لەشەخسی مەلا مستەفادا دەبینی و پێی وابوو ئەگەر مەلای کوشت نیتر هەموو شتێ بە کەیفی خۆی دەبێ. ئەگینە بۆچی کۆمەڵێ تەنازولاتی بۆدەکات و پاش ساڵێ دەیکات بە ئامانجی ئەوپیلانە ترسناکە؟ بۆ ئاگاداری بە رێکەوتێکی عەجیب بەرزانی رزگاری بوو لە کوشتن ؛ لە چرکەی تەقینەوەدا چایچیەکەی لەبەردەمیدا وەستابوو،

چای بۆ دادەنا. چاپچیی شەهید بوو بەرزانی سەلامەت بوو، پلانەکەی ئەبوو عودەیش شکستی خوارد.

ئەم دەستدرێژییەی سەدام گرژی و ئالۆزیەکی زۆری خولقاند لەنێوان بەرزانی و حکومەتی بەعسدا، بەڵام نەگەیشتە دەسپێکردنەوەی شەڕ. بەرزانی لە ئەسڵدا باوەڕی بە سەدام نەبوو. جا پاش ئەم پلانەش دەبێ چۆن بێ !؟ بەهەرحاڵ بێ بەڵگە نامەی ڕێکەوتنی ۱۱ ی ئازار وەکو خاڵێکی گرنگ چووە مێژووی خەباتی ڕزگاریخوازی کوردستانی عێراق.

لە خوارەوە کورتەیەکی چڕی ئەوبەیانە دەخەینە بەردەمی خوێنەران :

ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرش لەعیراق پەیوەندیی بە پارتی دیموکراتی کوردستانەوە کرد بە سەرۆکایەتی مەلا مستەفای بارزانی و گفتوگۆ لەلایەن هەردولاوە ئەنجامدرا سەبارەت بە مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد لە عیراقداو، لەئنجامدا هەردولا رێکەوتنامەی ۱۱ ی ئاداری ۱۹۷۰ ( ۱۹۷۰/۳/۱۱ ) یان لەو بارەیەوە ئیمزاکرد و دەقی ئەو ڕێکەوتنامەیە لە بەیانێکدا بڵاوکرایەوە کە بە بەیانی یانزەی ئازار ناسراوە و، بەمجۆرە دەست پێدەکات:

هاوڵاتیانی کوردی تێکۆشەر:

تەنها ویستی ئێوە بۆ یەکێتی نیشتیمانی سەردەکەوێت و، هەموو ئەو هەڵانە لەمر تاشەبەردی هۆشیاریتان بە بەرپرسیارێتی مێژووی تێک دەشکێن کە دەخوازن یەکانگیریی خەباتتان لاواز بکەن و، ئامانجە باڵاکانتان لە یەکێتی و ئازادی و سۆسیالیزمدا بەدی دێن.

جارێکیتر لەسەر ئەم خاکە بەسۆزەدا مەرجەکانی خۆشەویستی و ئاشتی و برایەتی لە نێوان دوو نەتەوەدا نوێ دەبێتەوە کە مێژووی خەباتی هاوبەشیان هەیە بەدرێژایی مێژو و، لە ئێستادا و لە سبەینێ و بۆ هەمیشە شەرەفی ژیانەوەی تێکۆشانی هاوبەشیان پێدەبەخشرێت بۆ زاڵبوون بەسەر دوژمنانی هەردوو نەتەوەدا.

بۆ تەواوکردنی هۆکارەکانی ڕابوونی ڕۆشنبیری و بەشداری پێکردنی جەماوەری کورد لە بنیاتنانی نیشتیمان و خەبات بۆ ئامانجە نەتەوەییە مەزنەکانی، ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بڕیریدا:

١ -زمانی کوردی بکرێتە زمانێکی فەرمی لەگەڵ زمانی عەرەبیدا لەو ناوچانەی کە زۆرینەی دانیشتوانی کوردن و، زمانی کوردی وەک زمانی دووەم لە عیراقدا بخوێنرێت لەو سنورانەدا کە یاسا دایدەنێت.

٢ -بەشداری پێکردنی برایانی کودر لە حوکمدا و جیاوازی نەکردن لە نێوان کورد و ئەوانیتردا لە وەرگتنی کارو فرمانە گشتیەکاندا لەوانەش پلەو پایە هەستیار و گرنگەکانی دەوڵەت وەک وەزارەتەکان و ئەوانەیتر.

٣ -لەبەر ئەو دواکەوتەی کە دوچاری نەتەوەی کورد بووە لە ڕابوردودا لە هەردوو بواری ڕۆشنبیری و پەروەردەییدا، پلانێک بۆ چارەسەری ئەوە دادەنرێت لە ڕێگەی:

ڕ- خێرا جێبەجێکردنی بڕیارەکانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش سەبارەت بە زمان و مافە ڕۆشنبیریەکانی گەلی کورد و، بەستنەوەی ئامادەکردن و ئاراستەکردنی بەرنامەی تایبەت بە کاروباری نەتەوەی کورد لە ئیزگەو تەلەفزیۆندا بە بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنی کوردیەوە.

ب- گەڕاندنەوەی ئەو قوتابیانەی کە فەسڵ کراون یا ناچاربوون کە واز لەخوێندن بێنن بە هۆی بارودۆخی توندوتیژیی لە ناوچەکەدا.

ج- کردنەوەی قوتابخانەی زیاتر لە ناوچەی کوردستاندا بەرز کردنەوەی ئاستەکانی پەروەردەو فێرکردن و وەرگرتنی قوتابیانی کورد لە زانکۆ و کۆلیژە سەربازیەکان و نێردەو خوێندنی دەرەوە بە شێوەیەکی دادپەروەرانە.

٤ -کارمەندانی ئەو یەکە کارگێڕیانەی کە زۆرینەی دانیشتوانەکەیان کوردن، کورد دەبن و بەرپرسانی بنەڕەتی وەک(پارێزگار، قایمقام، بەڕێوەبەری پۆلیس و ئاسایش لەوان دادەنرێت.

٥ -مافی گەلی کورد لە دامەزراندنی ڕێکخراوەکانی قوتابیان و لاوان و ژنان و مامۆستایانی تایبەت بەخۆی.

٦ -لێخۆشبون لە هەموو ئەوانەی کە بەشدارییان لە کاری توندوتیژیدا کردوە لە ناوچەی کوردستاندا و گەڕاندنەوەی کرێکاران و کارمەندانی مەدەنی و سەربازی بۆ خزمەت.

٧ -پێکهێنانی لیژنەیەک لە پسپۆران بۆ پەرەپێدانی ناوچەی کوردستان لە گشت لایەنەکانەوە لەڕێی پلانێکی ئابوریەوە و قەرەبووکردنەوەی زیان لێکەوتوان و تەرخانکردنی موچەی خانەنشینی بۆ ئەو خێزانانەی لە دۆخی شەڕی نەخوازراودا شەهید بوون.

٨ -گەڕاندنەوەی دانیشتوانی گوندە عەرەب و کوردەکان بۆ شوێنەکانی خۆیان و قەلرەبوکردنەوەی ئەوانەی کە بە هۆی یاساوە ناتوانن بچنەوە سەر شوێنی خۆیان.

٩ - جێبەجێکردنی چاکسازیی کشتوکاڵی لە ناوچەی کوردستاندا و پاکتاوکردنی پەیوەندیی دەرەبەگی و دانی زەوی گونجاو بە جوتیاران.

١٠ -ڕێکەوتن لە سەر هەموارکردنەوەی دەستور بەجۆرەی خوارەوە:

ڕ-گەلی عیراق لە دوو نەتەوەی سەرەکیی عەرەب کورد پێک دێت.

ب- زیادکردنی ئەم بڕگەیە بۆ مادەی چوارەمی دەستور:زمانی کوردی زمانی فەرمی دەبێت لەگەڵ زمانی عەرەبیدا لە ناوچە کوردیەکاندا.

١٢ -یەکێک لە جێگرانی سەرۆک کۆمار کورد دەبێت.

١٣- گەلی کورد بە ڕێژەی دانیشتوانی لە عیراقدا بەشداریی لە دەسەڵاتی یاساداناندا دەکات.

سەدام قبوڵی نەبوو هیچ ڕێخراوێ یان چالاکیەکی سیاسی لە عێراقدا هەبێ و لەژێر کۆنترۆڵی تەواوی خۆیدا نەبێ. ئەولایەنانەشی کەلێیانەوە ترسا دولایەن بوون : حشع + بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد. زۆر مەبەستی بوو کە ئەم دولایەنە نەگەنە ڕێکەوتن لەگەل یەکتر دژ بە ڕژێمی بەعس. ئەوکاتەی کە ڕێکەوتنی ١١ ی ئازاری لەگەڵ بەرزانی واژۆکرد حشع

ویستی و پارتیش هەرپێی باش بوو کە واژۆی شیوعیەکانیش لەسەر بەڵگە نامەکە بێت، بەڵام سەدام ڕێگر بوو. پاش واژۆکردنیش ڕاستەوخۆ شاڵاوێکی دڕندانەی سازکرد دژی شیوعیەکان بێ ئەوەی هیچ جۆرە پاساوێکی هەبێ، ژمارەیەکی زۆر لە کادرەکانی بە شکەنجە کوشت کە ئەندامی سەرکردایەتی علی بەرزنجیشیان لە نێو دابوو. ئەو شاڵاوە فاشیەی نەوەستان تا شکستی هەوڵەکەی بۆ کوشتنی مەلا مستەفا لە ١٩٧١. کە تێکچوون لەگەڵ بەرزانی کەوتنە هەوڵی ئاشتکردنەوەی شیوعیەکان و بەشێکیش لەسەرکردایەتی حشع خوا خوای شتێکی وەهایبوو. ئەوەبوو لەسەرەتای ئایاری ١٩٧٢ دا دوکەسی شیوعی ( عامر عبدوالله و موکەرەم تاڵەبانی ) چوونە ناو حکومەتی بەعس، بە بڕیاری مەکتەبی سیاسی.

پاش هەوڵە سەرنەکەوتوەکەی سەدام بۆ کوشتنی مستەفا بەرزانی لە ئەیلولی ١٩٧١ ئاشکرا بوو کە چارەنوسی ڕێکەوتنی ( ١١ ) ئازار کەوتە نێو تونێلێکی تاریک و ئاڵۆز. دەبوو سەرکردایەتی حشع موناقەشەیەکی قوولی هەڵوێستی سیاسیی خۆی بکردایە بەرانبەر بەو دۆخە، دەبوو بیزانیایە کە پیوەندی بەرزانی و سەدام بەرەو تازەبونەوەی جەنگ دەڕوات. بەڵام سەرکردایەتی حشع لە وەهمی ڕێگای نا سەرمایەداریدا دەژیا، بەتەمابوو سەدام ببێتە کاستروی عێراق بەرەو سۆشیالیزم. ئەم وەهمە ڕێڕەوی حشعی دیاری کردبوو ؛ حشع لەگەڵ بەعس دەوەستێ دژی پارتی. ئەوەبوو لە ئایاری ٩٧٢، پاش ٧ مانگ لە هەوڵی کوشتنەکە، بە دو وەزیر بەشداری کرد لە حکومەتی صەدام.

ناتوانم بڵێم پێویست بوو حشع خۆی ببەستێتەوە بە بەرزانیەوە لەوکاتەدا، چونکە بەرزانیش ڕێگەیەکی چەوت و پڕمەترسی گرتبوە بەر، ڕیشی خۆی دا بوە دەستی شا و دۆستەکانی شا. بەڵام دەیتوانی بێلایەن بوەستێ لەنێوان هەردولاداو بە گوێرەی گۆڕانکاریەکانی ئایندە هەڵوێستی خۆی دیاری بکات.

# ئۆتۆنۆمیەکی درۆینە بۆ کوردی عێراق کە لەسەر دەستی حشع مۆر کرا

ئۆتۆنۆمی هەر لەسەرەتاوە جێگەی دڵخۆشی و ڕەزامەندی کەس نەبوو جگە لە هێندێ ئەندامانی سەرکردایەتی حشع، چونکە بە ئیفلیجی لەدایک بوو، پێداویستی ژیان و گەشەکردنی تێدا نەدەبینرا. سەدام نەیویست ناوی وەزیریش بدات بە دەزگای حکومڕانی هەرێم، بەڵکو ناوی ( امین عام ) ی لێنان و تەنها دوکورسی امین عام و ٨ کورسی ئەندام تەشریعی دا بە حشع. بەهەر هەمویان دەسەڵاتی پۆلیسێکی ئاسایشی بەعسیان نەبوو. لەساڵانی ئەو ئۆتۆنۆمیە درۆینەیەدا هەرچی تاوان و خراپەکاری هەیە دەسەڵاتی دیکتاتۆری صدام دەرهەق بە گەلی کورد کردی، بەتایبەتی پاش ئاشبەتاڵەکەی ١٩٧٥، بەڵکو دەرهەق بە خودی حشعیش کردی و سەرکردایەتی حشع هەر بێدەنگ مایەوە. ئەمین عام و ئەندام تەشریعیەکانی حشع لە کوردستانیش . وەکو هەردو وەزیرەکەی حشع لە بەغدا . فزەیان نەکرد چونکە سەرکردایەتی حیزبەکەیان داوای هیچی لێنەدەکردن و خۆ هێندە غیرەتیان نەبوو دەسپێشخەریەک بکەن یان لانی کەم دەسلەکار بکێشنەوە. داواو کرداری شیوعیەکان بەرانبەر بەهەموو دەستدرێژی وکوشتاری ڕژێمی فاشی هاوپەیمان بریتی بوو لەداواکردنی کۆبونەوەی لیژنەی بەرە لەسەر ئاستی پارێزگا یان ئاستی ناوەندی. بۆ ئاگاداری ئەم کۆبونەوە، بیشکرایەت، نە هیچ دەسەڵاتێکی هەبوو نە هیچی لەو وەزعە تاڵە دەگۆڕی.

سەدام گەیشتە ئەو باوەرە کە حشع توانای هیچ جمو جوڵێکی نەماوەو زەبرێکی کوشندەی لێدراوە، هەڵناسێتەوە سەر پێ. ئەم بۆ چونەش نزیکبوو لە ڕاستی. ڕێکخستنەکانی حشع، بەتایبەتی لە ناوچە

عەرەبیەکانی عێراقدا، تێکشێکێنرابوو بەسەریەکدا و ئاسایشی بەعسی تۆڕێ لە سیخوراتی تێدا چاندبوو. زۆرینەی هەرە زۆری کادرەکانی حشع یان توانیبویان خۆیان دەزباز کەن بۆ دەرەوەی وڵات ( لە کوردستاندا بۆ دەرەوەی شارەکان ) یان بە هۆی نارەزاییەوە لە سیاسەتی پاشکۆگەری حشع هەموو پێوەندیەکیان لەگەڵ حیزب بڕیبوو لەماڵی خۆیان دانیشتبوون.

لەبەرنامەی بەرەی هاوکاری لەگەڵ سەدام حشع ئەوەی واژۆکردبوو کە جگە لە حیزبی بەعسی سەرکردە بۆ هیچ حیزبێکی دیکە نیە چالاکی و رێخستنی سەربازی لەناو سوپادا هەبی. حشع ئەوەشی واژۆکرد کە رێخستنە جەماوەریەکانی خۆی لە نێو خوێندکاران و لاوان و ئافرەتان و..... هتد هەڵوەشێنێتەوەو تەنها بەعس مافی چالاکی هەبێ لەم بوارانەدا. لەگەڵ ئەم هەموو پاشەکشە ئا لۆژیکیەش سەدام وازی نەهێنا لە قەلاچۆکردنی شیوعیەکان، چ بە نهێنی ( ایغتیالات ) و چ بە ئاشکرا، ئەوانەی بەنهێنی دەکوژران ئەو کادرانەبوون کە بەعس بەخەتەری دادەنان و هەڵیدەبژاردن بۆ کوشتن. ئەوەشی بە ئاشکرا، بە بڕوبیانوی درۆوە، حوکمی ئیعدامیان دەدرا، بەمەبەستی ترساندنی شیوعیەکان و جەماوەری عێراق بە گشتی. بە پێچەوانەی بەیانی ١١ ئازاری ١٩٧٠ کە کۆمەڵێ لە مافی ڕاستەقینەی نەتەوەیی و ئیداری و ڕۆشنبیری هاتە دەستی کورد، ئۆتۆ نۆمیە درۆینەکەی ٩٧٤ ی حشع - سەدام هەر لەسەرەتاوە بە ئیفلیجی لەدایک بوو، بە ئیفلیجی ٥ ساڵ مایەوە و دواتر مردار بووەوە و گچکە ترین ئاسەواری باشی بەدوای خۆیدا جێنەهێشت. باشە ئەوەش بزانرێ کە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی حشع و زۆرینەی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی ڕێکبوون لەسەر سیناریۆی ئەم فلیمە کاریکاتێریەی ئۆتۆنۆمی، بەڵام ئەندازیاری سەرەکی پرۆژەکە سکرتێری حشع و کەسایەتی ناسراوی کورد کۆچکردوو عزیزمحمەد بوو.

# ( ئاشبەتاڵی ١٩٧٥ ) – دارمانی خەباتی چەکداری

ئەوگـرژی و ئـاڵۆزیەی پـلانەکەی سـەدام بـۆ کوشـتنی بەرزانـی بەرپـای کـرد جـارێکی تـر نەڕەویەوە. بە پـێچەوانە، تـا دەهـات گرژتـر دەبوو، وردتر بڵێین دەسـپێکردنەوەی شـەڕ نزیکتـر دەبۆوە. بە کـاریگەری بەشداری حـشع - ئەگەر بەشـداریەکی ڕوکەشـیش بـوو چـونکە ئەو دو وەزیرە شیوعیە بەقەد دوفەراشی بەعسی سەلاحاتیان نەبوو – پەیوەندی پـــارتی و حـــشع ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەرەو گرژتـــر دەچـــوو. لە پـــێش دەسپێکردنەوەی شـەڕ لە نێـوان حکـومەت و پارتیـدا بەرزانـی فەرمـانی کرد بە چەککردنی پێشمەرگەکانی حشع.

تەنهـا لەبـنکەی قەرەداغ پێـشمەرگەکانی حـشع خـرانە ژێـر هەڕەشـەی چەککردن و بەدەم شەڕکردنەوە لە بەلەکجاڕەوە کشانەوە بۆ دەربەنیخان. لەبنکەکانی تر پێشتر تەگبیری حاڵی خۆیان کرد و گەیشتنە جێگەی خوازراو. شـیوعیەکان لەنـاو شارە کوردەکانیـشدا مەترسییان لەسـەربوو، زۆریان بەناچاری ماڵ وحاڵی خۆیان جێهێشتبوو.

لە ٩٧٤ دا مەلا مستەفا گەیشتە لوتکەی شـەعبیەتی خۆی، بـوو بە پەرستراوی جەمـاوەری کـورد، بەڕێژەی ٩٠./. گەیشتبوونە ئەو قەناعە تە کە سـەرکەوتنی تەواو بەدەسـت دەهێـنن دژی ڕژێمـی سـەدام، پـاش ئەوەی سـەرکەوتنی ١١ ی ئازاریـان بینـی. وەکـو قارەمـانی ڕزگـار کەری کورد دەیان ڕوانیە مەلا مستەفا. گەنجانی شارو شارۆچکەکان پـۆل پـۆل شـاریان جێدەهێـشت و دەچـوونە نـاو ڕیزەکـانی خەبـاتی چەکـداری. ئەگەر ئافرەتـانی ناوشـار گەنجێکیـان لەنـاو کۆڵانەکانـدا ببینییایە بەتۆنی ڕەخنە ئامێز دەیانوت :

- ئای ئای ! خۆ ئەوە هەر لەناوشاردایە، نەڕۆیشتووە !!

له ۹۷٤ دا که شەڕ دەستی پێکردەوە زیاتر له ( ۱٥۰ ) هەزار کەس چووبوونە سەنگەر یان لەدەورروو بەری سەنگەرەکان بوون، بەدرێژایی مێژووی کۆن و تازەی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد هێزێکی چەکداری وەها گەورەی بۆ کۆ نەبۆتەوە. بەڵام دەبێ ئەوڕاستیە بوترێ که هەر پیاوەکان دەرچووبوون، کچان له گۆڕەپانی خەباتی چەکداریدا نەبوون.

شەڕ لەکوردستاندا گەرم بوو. چەکدارانی کورد بەورەیەکی بەرزو باوەڕێکی پتەوەوە بەسەرکەوتن دەجوولان و دەدوان، لەکاتێکدا لەپڕ، لەچرکەیەکدا شایی بوو به شیوەن، هەڵپەرکێی بەختەوەری بوو به باوکەڕۆی نەهامەتی. هەواڵی ناخۆش گەیشته هەموو گۆشەیەکی کوردستان :

- ئاشبه تاڵ کرا !

- ئاخر بەم هەموو هێزوتوانایەوە، بەم هەموو چەک و تەقەمەنیەوە بەم سەدان هەزار پێشمەرگەوە... چۆن له چرکەیەکدا گەیشتینه ئاش بەتاڵ؟ ئەیهاوار خەریکه شێت دەبم !! بمبەن بۆ شێت خانه !

- بەشکو ئیشەڵا درۆبێ، کارەساتی وەها نەبێ. خوایه ئەم پەنەمان پێ نەدەیت !

- قوڕ بەسەر عەقڵی من و تۆ

- وەڵا برا من برایەکم شیوعیه، هەرزوو پێیوتم : ( ئێوه کوێخای خۆتان نین، کوێخاکەتان له تارانه و کلیلەکەش لەدەستی ئەودایه، هەرکات بیەوێ به ئاسانی قفڵەکه دادەخات ). ئەوه قسەی براکەم ڕاست دەرچوو.

- ئەو شیوعیه بێقیمەتانەش سەدام حسینیان کردووه به کوێخای خۆیان . ئەویش له شای ئێران سەگبابتره ! ئیشەڵا ئەوانیش له ئێمه خراپتریان بەسەردێ.

- ئەوان هیچیان بەسەر نایەت چوونکە چەکیان هەڵگرت و بەرگریان لەسەدام کەرد.

- سەدام ئەوەفای بۆ کەس هەیە وئە ئەمانی هەیە. قوڕ بەسەری ئێمەش و شیوعیەکانیش. سەدام و شا برای یەکترن ە ئێمەو شیوعیەکان یەک لەیەک ئەگبەتترین.

- بەخوا من ئەم چەکەی هەڵم گرتووە فرێینادەم. ئەگەر بەتەنیاش ماومەتەوە هەر دەجەنگم دژی عەرب، بۆ ڕزگار کردنی کورد و کوردستان.

- تۆ بەتەنیا چەک هەڵ دەگری؟ ڕەحمەت لە باوکی ئەوە ئەتوانی جرتێکی ئەسڵی سلێمانیانەی بۆ لێدا.

- ئێمە خەتای خۆمانە ئەگینە ڕیشی خۆمان نەددایە دەست شای ئێران.

- وەڵلە من ڕیشی خۆم نەداوەتە دەست شای ئێران. من ڕیشم داوەتە دەست مستەفا بەرزانی و سەرکردایەتی ئەوم هەڵبژاردووە. کورد هەرچی لێبێ گوناهەکەی لە ئەستۆی بەرزانیدایە.

بەڵێ پێشمەرگەکان لەوکاتە دەیانتوانی هەرکەس ڕاوبۆ چوونی خۆی بە ئاشکرا بلێ، بەڵام کەسیان نەیان دەتوانی بگاتە لای شا لە کۆشکی ( سعد اباد ) سکاڵای خۆی بگەیەنێ بە شا. حەمە ڕەزا شا خۆی ناردی بەشوێن مەلا مستەفادا و پێی ڕا گەیاند :

ناردوومەتە شوێنت پێتبڵێم کە لەمڕۆ بەدواوە ناتوانم یارمەتیتان بدەم. دەبێ کۆتایی بەشەڕ بهێنرێ و هەرکەسێک دەخوازێت بێتە ئێران بژی ئەوە ڕێگەی پێدەدرێ و ئەویشی دەچێتە ماڵی خۆی لە عێراق با بچێ. گرنگ ئەوەیە ئیتر شەڕ تەواو.

مەلا مستەفا سەرۆکێکی سیاسی جەماوەری کوردی عێراق بوو. بەڵام سەرۆکێ بوو لە شێوازی کۆنی عەشایەری، تاکەکەسی.

نەیتوانی میلەتەکەی خۆی، کە سیقەی پێدابوو، بەشێوەیەکی ڕاست ودروست ئاراستە بکات. ئەم میلەتە ستەم دیدەیە لەکاتێکدا کەبەتەمای سەرکەوتنێکی گرنگ بوو برایە هەڵدێرێکی ترسناک و لەبەرزاییەکی هەزار بەهەزارەوە کەوتە خـــوارەوە، بە زەلیلـــی کەوتە بەردەســـتی دڕندەیەکی هەمیشە تینوو بەخوێنی ئادەمیزاد، بەردەستی سەدام. دەیەها هەزار کەس دەربەدەر کـــران بـــۆ دەرەوەی نیـــشتیمانی خۆیـــان، یـــان ڕاگوێزکران لەناوچەی ژیانی باوک و باپیریانەوە بۆناو عەرەبەکان لە باشـــورو ڕۆژاوای عێـــراق، یـــان خزێنـــرانە بەنـــدینخانەکانەوە. ئەوانەش کەمنەبوون سەدام بە شکەنجە کۆتایی بە ژیانیان هێنا. جا کورد چ دەرسێکی لەم تێشکانە گەورەیەی ٩٧٥ فێر بوو کە بە ڕێکەوتننامەی جەزایر ناسراوە؟

# حشع به ئەركی خۆی هەڵنەستا
# بەرانبەر میللەتی كورد

ئاشكرایە كە حشع بەرانبەر شەڕی ٩٧٤ — ٩٧٥ لە نێوان ڕژێمی بەعس و كوردا شان بە شانی سوپای عێراق دژ بە هێزی چەكدارانی پارتی وەستا. شایانی باسە بەر لەدەست پێكردنی ئەو شەڕە حشع لەگەڵ حیزبی بەعسی سەدامی ڕێكەوتبوو لەسەر بەستنی بەرەی نیشتیمانی و نەتەوەیی پێشكەوتنخواز ( الجبهه الوطنیه والقومیه التقدمیه ). ئەم بەرەیە لەكاتی خۆیدا مشتومڕی زۆری لەسەر بوو لەناو حشعدا، چ لەسەر ئاستی سەركردایەتی چ لەسەر ئاستی كادری حیزبی. بە گوشارێكی ئاشەرعی سكرتێری حشع ئەم بەرەیەی سەپاند لەكۆبوونەوەی كۆمیتەی ناوەندیدا. بەڵام خاڵی لاوازی ئەوانەی دژی بەرە بوون لەگەڵ بەعسدا لەوەدا بوو كە سەركردایەتی شۆڕشی چەكداری كورد بەهیچ قەدەرێ سەربەخۆیی لەدەستدا نەمابوو، چارەنووسی شۆڕشەكە لەدەستی شای ئێراندا بوو، وەك ڕێكەوتنامەی جەزایربەكردەوە نیشانیدا.

كەڕێكەوتنامەی جەزایر بڵاو كرایەوە دوڕای لێكجیاواز لەناو حشعدا پەیدا بوو. یەكەمیان ڕای فەرمی حشع كە دەیووت :

( دەبێ شیوعیەكان خۆشحاڵبن بەسەركەوتنی ڕژێمی نیشتیمانی پێشكەوتنخواز بەسەر تاقمی نۆ كەراندا - یجب ان یفرح الشیوعیون بانتصارالسلطه الوطنیه التقدیمیه علی الجیب العمیل؟؟ )

دووەمیان ڕای كۆمیتەی هەرێمی كوردستان — ڕێخراوی حشع — كە دەیوت :

( پاش سەركەوتنی ڕژێمی بەعس بەسەر بزووتنەوەی چەكداری كوردا ڕژێم بەو پەڕی دڕندانە ئازاری میللەتی كورد دەدات و

ئامـانجی دواتـریش لێـدانی حـشع دەبـێ. لەبەر ئەوە پێویـستە لەسـەر شیوعیەکان لە ئیستەوە ئیحتییاتی خۆیان وەرگرن، چەکەکانی خۆیان بپارێزن، چەکی دیکەش بکڕن و ئامادەبن بۆ بەرەنگار بوونەوەی ڕژێمی بەعـس بـۆ بەرگـری لە میللەتـی کـورد و لە خـودی حـشعیش، دژی هێرشی چاوەڕوانکراوی ڕژێم.

لە ٢١ ئەندامی کۆمیتەی هەرێم ١٨ کەس واژۆی ئەم کۆ نووسەیان کردو ٢ کەس ( یوسف حنا و فاتیح رسول ) دژبوون و یەک کەسیش ( عـادل سـلیم ) لاقێکـی لەم لاو لاقێکـی لەولا. کۆنووسـی کۆبـوونەوە نێـردرا بـۆ مەکتەبـی سیاسـی، داوای پـارە کـرا بـۆ چەککـڕین . بە برووسکە یەکەم بڕگەی وەڵامـی مەکـتەب سیاسـی هـات : ( بەهـادین نوری فەورا دێتە خوێندنگەی حیزب لە بەغـدا دەبێتە موحازر + احمد بـانیخێلانی دێتە بارەگـای ناوەنـدی حیـزب ولەوێ دەمێنـێ ). بڕگەی دووەم لەوەڵام : نـاردنی زەکـی خیـری بـۆ غـسل دمـاغی ئەنـدامانی کۆمیتەی هەرێم.

ڕۆژانی دواتر ئەو ڕاستییەیان ڕوونکردەوەکە سیاسـەتی حشع، بەهیـوای بردنـی عیـراقە، لەژێـر سـەرکردایەتی سـەدامدا، بەرێـگەی پێشکەوتنی ناسـەرمایەداری، بەرەو سۆشـیالیزم، لە وەهـم بەولاوە هیچـی دیـکە نـیە. ڕووداوەکـانی ئایینـدەی عێـراق دەریخـست کە ئەنـدامانی مەکتەبـی سیاسی پێویستیان بە ( غسل دماغ ) بوو نەک ئەندامانی کۆمیتەی هەرێـم کە هەمـوو شـیکردنەوەکەیان بـۆ بـارودۆخی ئەوکـاتە ڕاسـت دەرچـوو. سـەرکردەکانی حیـزب هـیچ بـاجێکی ئەو هەڵە کوشـندانەیان نەدا، بە پێچەوانە، تـا ئیستە حشع هەر باجی هەڵەکـانی ئەوان دەدات. گەلی کوردستانیش باجی قورسی هەڵەکانی ئەوانی دا.

جـگەلەوە هەمـوو کەس دەزانـێ کە ئەگەر لەوکـاتەدا حشع بەرگـری لە میللەتی کورد بکردایە پێگەی حیزب چەند بەهێز دەبوو.

# پاساوی لۆژیکی نەبوو
# بۆ چەکدانان و تەسلیم بوون بە ئیرادەی شا

لە ١٩٧٠ بالی مەکتەبی سیاسی خۆی هەلوەشاندەوە هەموو پارتی و هەموو بزووتنەوەی چەکدارانی کورد کەوتە ژێر دەستی بەرزانی بەتەنها. لە ٩٧٥ بۆچی ئەو تێشکانە گەورەیە لەوبزوتنەوە جەماوەریە گەورەیەدا ڕوویدا؟ خۆ تێشکانی سەربازی نەبوو؟ دارمانی ١٩٧٥ ئەنجامی یەک وشەی شای ئێران بوو کەبە بەرزانی ووت :

- ئیتر من یارمە تیتان نادەم.

بەرزانی هەموو شتێ بوو لە شۆڕشدا و بەو قسەیە هەموو شتێ دارما. هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕاستیە کە لە ١٩٧٥ یشدا بەرزانی هێشتا بە عەقلیەت و شێوازی خێلەکی سەرکردایەتی شۆڕشی میلەتەکەی خۆی دەکرد. چۆن سەرەک عەشیرەیەک تەنیا بڕیار دەدات لەسەر هەر شتێ ڕووبەڕووی دەبێتەوە ئەویش هەر وای کرد. ئەو مامەلەی شارستانیانەی لە گەل حیزبەکەی نەکرد و هیچ کۆمیتەیەکی سەرکردایەتی ڕاستەقینەی نەبوو. تەنها خۆی بڕیار بەدەستبوو. شتی وەها لەسەردەمی شۆڕشی شێخ مەحمود یان شێخ سەعیدی پیراندا نیشێکی ناسایی بوو، بەلام لە ٩٧٥ کاتی بەسەر چوو بوو. بە بۆ چوونی من دەبوو بەرزانی بە شای بوتا یە :

دەبێ دوقسە لەگەل سەرکردەکانی سیاسی و سەربازی خۆم بکەم ئەوسا دەتوانم وە لامتان بدەمەوە.

بە بۆچوونی من کورد توانای درێژە پێدانی شەڕی هەبوو لە چوار چێوەی ئەم خالانەی خوارەوەدا :

١-ئەو ( ١٥٠ ) هەزار کەسەی کە چووبونە دەرەوە تەسک بکرایەنەوە بۆ ( ٣٠ ) هەزار گەنجی هەلبژاردە و سەر لەنوێ ڕێبخرایەنەوە بۆ

چەک هەڵگــــرتن بەشــێوەیەکی گونجـــاو لەگەڵ پێداویـــستی ئەو بارودۆخەدا. بڵاوە بەوی دیکەی بکرایە بەشێوەیەکی مەدروس.

٢- ئەو بڕە پارەیەی شۆڕش کە بە پێی نوسراوی د. محمود عوسمان ٥٣ ملیـۆن دینـاری ئەوکـاتەبوو یەکسان بـوو ( ١٦٠ ) ملیـۆن دۆلار ) کە لەدەســتی بەرزانــی دابــوو، بـدرایە بە لیـژنە یەکـی ڕێکخـراو بـۆ مەسروفاتی شۆڕش.

٣- یــان شــیوعیەکانی کوردســتان بچوانـایەتە نـاو پـرۆژەکە، بەبـێ سـەرکردایەتی عزیـز مـحەمەد، و بەرزانــی هەلبژێـردرایە بە سـەرۆکی فەخری شۆڕش و هەوڵی چڕ بدرایە بۆ چارە سەرێکی مام ناونجی ئا شتیانە.

دەزانم ئەم پێشنیارانەی مـن زۆر بەزەحـمەت جێبەجێدەکرا. بەلام پێم وایە گوشـارێکی میللی گەورە دروسـت دەکـرا بـۆ جێبەجـێ کردنـی ئەگەر سەر کردایەتیەکی لێزان سەرپەررشتی ئیشەکەی بکردایە.

# پەیدابوونەوەی چەند حیزبێکی نوێ و دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکداری

تێشکانی گەورەی بزووتنەوەی چەکداری لە ئازاری ١٩٧٥ دا بۆ شاییەکی گەورەی لەگۆڕەپانی سیاسی کوردستاندا دروست کرد، شەخسی مەلا مستەفای خستە دەرەوەی هاوسەنگی سیاسی، لەکاتێکدا کەبالی مەکتەب سیاسی لەپارتی لەدوای بەیانی ( ١١ ) ئازار هاتە سەر سفر و حشعیش بووبوو بە پاشکۆیەک بۆ ڕژێمی فاشی سەدام. لەو کاتەدا هەلێکی لەبار هاتەپێش بۆ زیندووکردنەوەی باڵی مەکتەبی سیاسی، بەڵام بەبێ برایم احمد، بەسەرکردایەتی جەلال تالەبانی و بەناوێکی تازەوە ( یەکیەتی نیشتیمانی کوردستان ). دامەزرێنەری بنەرەتی وسەرکردەی جلال تالەبانی بوو، ئەم شەشەی تریشی لەگەڵ بوون : نەوشیروان مستفا، کمال فوئاد، فوئاد معصوم، عادل موراد، عومەر شێخ موس، عبدالرزاق فیلی. لەگەڵ بڕیاری دامەزراندن بڕیاری دروستکردنی مەفرەزەی تازەی سەربازیش وەرگیرا. تالەبانی ڕێخراوی تازەی لەشێوەی بەرەیەکدا دروستکرد. بەشی یەکەمی و بنەڕەتی ناونرا ( کۆمەڵەی مارکسی – لینینی ) کە بۆ خەباتی چەکداری پشتیان پی دەبەسترا، لە لاوانی تازە پێگەشتووبوون. بەشی دووەمی ی.ن.ک پێکهاتبوو لە ( شۆڕشگێڕان ) کە د.فواد معصوم بەر پرسیان بوو. ئەمەش کەسانی نیشتیمانپەروەری دەگرتە خۆ لەوانەی بەس کوردایەتیان دەکرد و مارکسیزمیان قووبوڵنەدەکرد. ئەمانەش مەفرەزەی چەکداریان هەبوو، بەڵام بەقەد کۆمەڵەو لە ئاستی کۆمەڵەدا نەبوو.

بەشی سێهەمیان ناودەبرا بە ( خەتی پان ). ئەمانە کۆمەڵی ئاغاو شەخسیات بوون کەتاقەتی ڕێخراوو دیسیپلینیان نەبوو، لەدەوری تاڵەبانی خۆی کۆ بوو بوونەوە.

دەبێ بپرسرێ بۆچی تالەبانی کە ( ٣٠ ) ساڵ بوو سەرگەرمی کوردایەتی بوو لە پڕ، لە ٩٧٦ دا، ناوی ( مارکسی - لینینی ) هەڵبژارد بۆ ڕێخراوی تازە؟ من ئەو پرسیارەم ئاراستەی خودی تالەبانی کرد لە هاوینی ٩٨٦ دا، کاتێ چومەلای لە گوندی ( یاخسەمەر ) - شار بازێڕ - وەڵامی دامەوە ووتی :

- بۆ ماوەیەک بووم بە ماوی.

لەلایەکی دیکەوە، ئەگەر چی مەلا مستەفا خۆی لە تێشکانی ئازاری ٩٧٥ وە گۆڕەپانی سیاسی کوردستانی بە جێهیشت، بەڵام کورەکانی ( ئیدریس و مەسعود ) خۆیان بەخاوەنی گۆڕەپانەکە دەزانی و کەزانییان جلال تاڵەبانی سەرگەرمی دروستکردنی مەفرەزەی چەکداری نهێنیە ئەوانیش کەوتنە جموجۆڵ بۆ زیندوکردنەوەی مەفرەزەی چەکداری. واتە ئەگەر چی دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکداریان بە ( شۆڕشی نوێ ) ناونا، بەڵام هەر درێژە پێدانی ئەوەکەی جاران بوو، بە هەموو باش و خراپییەوە، بە شەڕی برا کوژیەکەیانیشەوە کە لە ٩٦٤ وە دەستی پێکرد وبەدرێژایی سالانی ٩٦٦ — ١٩٧٠ بەردەوام بوو. هەرئەوکاتەش کە برایم احمد سکرتێری مەکتەب سیاسی بوو شەڕ کەرەکان ناو دەبران بە ( مەلایی و جەلالی ) نەک مەلایی — برایمی، چونکە چالاکی جلال لە گۆڕەپانەکەدا زیاتر بوو لە برایم احمد.

واتە باڵی مەکتەب سیاسی جاران بەناوی ( ی.ن.ک ) وەو باڵی مەلاییش بەناوی ( قیادە موقتەوە ) پەیدا بونەوە لە گۆڕەپانەکادا.

ڕێخـراوی سـیهەم کەهەر لەدارو بەردی پـارتیە کـۆنەکە دروسـتکرا.
بـزووتنەوەی سۆشیالیـستی کـورد بـوو کە بەرپرسـی یەکەمـی صـالح یوسفی بوو، بەرپرسی مەیدانیشی علی عەسکەری بوو. ئەم بزووتنەوەیە لەسەرەتاوە تەوژمێکی بەگوڕ بوو، زیاتر لەوانە درووستبوو کە زۆرتر لە هەردوو بالی مەلایی و جەلالی رازی نەبوون. خەڵکێکی زۆری لەدەور کۆبـوو بـوەوە، بەڵام پـاش کوشـتنی صـالح یوسـفی لەلایەن ڕژێـمەوە و کوشتنی علی عـسکری لەلایەن پارتیەوە لەشـەڕی بـرا کوژیـدا کەوتە لاوازبوون و لەتبـوون هەتـا ئەوەی لێیمـایەوە کە ئیـستە بەنـاوی ( حیزبـی سۆسیال دیموکراتی کوردوستانەوە ئیش داکات ).
ڕێکخراوێکی نەتەوەیش پەیدا بووکە گوایە نەتەوەیی توند ڕەو بـوو ( بەنـاوی پاسـۆکەوە )، بەڵام جیـاوازیەکی ئەوتـۆی نەبـوو لەگەڵ حیـزبە نەتەوەیەکانی تر. لەگەڵ ئەوەش زۆر خۆی پێ ڕانەگیراو توایەوە.

# گورزێکی گەورە ئاراستەی (ی.ن.ك) کرا
# لە شەڕی برا کوژیدا لەهەکاری

لە ٩٧٧ سەدان کەس لەپێشمەرگەی یەکیەتی و بزووتنەوەی سۆشیالیستی کورد بەسەرکردایەتی علی عەسکەری لە نیو زەنگەوە بەرێکەوتن بەرەو بادینان گوایە دەچن بۆ سنوری سوریا بەمەبەستی هێنانی چەک. لەرێگادا، لەناوچەی هەکاری ئەم هێزە، کە بە قسەی هێندێ لەسەرکردەکانی ئەو کاتەی ی. ن. ک، پێکهاتبوو لە (٧٠٠) کەس بەڵام هەموویان چەکیان پێنەبوو، تووشی شەڕ دەبێ لەگەڵ پێشمەرگەکانی قیادە مووقە تە ( پارتی ) کەبەچەکدارانی عەشایری ئەودەڤەرەش یارمەتیان دەدرێ. ئەنجامی شەڕەکە لەبەرژەوەندی قیادە موقتە دەبێ. هێزەکەی ( ی ن ک ) لەناودەبرێ، ژمارەیەکی زۆر کوژراوو بریندار دەبێ، ئەوی دیکەش تەفرو توونا دەکرێ. کەسی لێنا گەرێتەوە بەسەلامەتی - بەقسەی محەمەدی حاجی مەحمود - جگە لەمەفرەزەیەکی شەش کەسی کە محمد خۆی سەرکردایە تیان دەکات.

ئەم تێشکانە گەورەیەی ( ی ن ک ) پاش ساڵێ لە دەستپێکردنەوەو دروستکردنی مەفرەزەی چەکدار، بەر لەوەی کە پێشمەرگەی هیچ لایەنێ سەرکەوتنێکی بچووکیش تۆمار کات دژ بە ڕژێمی فاشی بەعس. لەشەڕەکەدا پارتی سەرانی هێزەکەی ( ی ن ک ) ی ( علی عەسکەری و حسین با با شێخ و د. خالیدی ) گرت بەدیل و دواتر بەڕەزامەندی مەلا مستەفا ئیعدامی کردن. دوای شەڕە تفەنگەکەیش شەڕەقسەو شەڕە نووسینێکی قورس لەنێوانیاندا دەستی پێکرد، ی ن ک دەڵێ ( ئێمە بۆ شەڕ نەچووبووین، بۆ هێنانی چەک لەسوریا چووبووین، پارتی شەڕی تێناڵانین ). پارتیش بە پێچەوانەوە. لێرەدا

پرسیارێک دیتە کایەو موناقەشەی دەوێ : ئەم دولایەنە کامیان ڕاست دەکات؟ ئەم شەڕە لەناو خۆیاندا بۆ دەکەن؟ کامیان خەتا بارە؟

ئەگەر پێوەرمان تەنها قسەبێ ئەوە هەردولایان بۆڕزگارکردنی میللەتی کورد لەدەسەلاتی رەگەز پەرەستی فاشی سەدام چەکیان هەلگرتووە. رێگەی رزگارکردنی میللەتی کورد لە زولم و تاوان کاری بەناو شەڕی برا کوژیدا ناڕوات، بەلکو بەیەکریزی و هاوخەباتی ریزەکانی گەلدا دەڕوات. بەرزانی باوکیش و کوریش و تالەبانی باوکیش و کوریش هەموو ئەم ڕاستیە دەزانن، بەلام هەرکەسە بەرژەوەندی تاکەکەسی خۆی خستۆتە سەروی هەموو شتێکیتر. هەرکەس دەیەوێ خۆی شەخسی یەکەم بی، خۆی بەسەر شانی میلەتدا سەرکەوێ بۆسەر کورسی دەسەلات. ئەگەر لەرۆژانی ۹۷۷ هێندێ کەس نەیدەتوانی لەم ڕاستیە بگات ئەوە ۲۷ سالی حکومرانی لەدوای ۹۹۱ وە ئەم پرسەی بۆ هەموان ڕوون کردەوو.

پرسیارێکی دیکەش دێتە ئارا : باشە، کەشەڕەکە بۆ بەرژەوەندنی تایبەتی خۆیان دەکەن ئەو هەزاران گەنجە بۆ دەچن شەڕدەکەن و خۆیان بەکوشت دەدەن؟ زۆرلەو گەنجانە دەچن شەڕیان بۆدەکەن خۆیان دەدەن بەکوشت پێیان وایە ئەمە لەپێناوی گەل ونیشتیماندا دەکەن، چوونکە پلەی هوشیاریان نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەکە بەتەواوی لە ڕاستیەکان تێبگەن و نەخەلەتێنرێن.

دێمەوە سەر شەڕی هەکاری : خەتای کامیان بوو؟ لەولاتی دیموکراتی پێشکەوتوودا سندووقی دەنگدان هەیە بۆدیاری کردنی دەسەلاتدار، بەلام لەولاتی دواکەوتوودا زۆر جار تەزویری هەلبژاردن و هێندێ جاریش شەڕە تەقە دەچێتە جێگەی سندووقی هەلبژاردن. لەکوردستاندا هەردوولایان شەڕخواز بوون, بەلام لەهەموو شەڕەکاندا وەکو یەک بەرپرسیار نین، هێندێ جار ئەمیان زیا ترو هەندێجاریش

ئەویتریان زیاتر. بەڕای من لەشەڕی هەکاریدا یەکێتی خەتابارتربوو چونکە ناردنی ( ٧٠٠ ) کەس بۆ چەک هێنان لۆژیکی نیە. ئەوناردنە بە بڕیاری تاڵەبانی و نوشیروان مستە فاو موا فەقەی علی عەسکەریش بوو، دەشیان زانی کە ٧٠٠ کەس لەوڕێگە دوورو درێژەدا ناشاردرێتەوە و لەگەڵ پارتیشدا لە حاڵەتی جەنگدان.

ڕەنگە لەوەدا هەڵەیان کردبێ کەپێیان وابووبی لەهەرشەڕێکدا ببێ خۆیان سەردەکەون.

لەگەڵ ئەم تێشکانە گەورەیەی هەکاریش، کە بە وتەی کەمال خۆشناوی ( یەکێ لەسەرکردەکانی ئەوکاتەی ی ن ک ) گەورەتربوو لە تێشکانی ئازاری ٩٧٥، یەکێتی توانی لەماوەیەکی کورتدا ئەوبرینە گەورەیەی سارێژ بکات. ئەوەش لەپلەی یەکەمدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە لاوانی کوردستان ئامادەبوون بچن بە پیر بانگەوازی پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەکە تێشکانی ٩٧٥ لە گۆڕەپانەکەدا خولقاندی.

# بەدیل گرتنی نەوشیروان مستەفا
# لەشەڕی براکوژیدا

لەساڵی ۱۹۸۰دا حسک هاواری بوو لەدەست ینک کە لەم لاو لەولا پێشمەرگەکانی چەک دەکات. بەمەبەستی تۆڵە سەندن هێزێکی حسک بەسەرکردایەتی سید کاکە لە گورەشیرەوە کەوتەڕێ بەرەودەشتی هەولێر. لەو ناوە عەزیەتی زۆری مەفرەزە چەکدارەکانی ینکی دا، زۆری لێ چەک ککردن و پەرتوو بڵاوی کردنەوە. پاش ئەم تێشکانە وەک دەوترا ینک بڕیاریدا لە پارێزگای سلیمانی تۆڵە لە حسک بکاتەوە. نەوشیروان مستەفا وا پێباشبوو کە خۆی بچێ سەرکردایەتی ئەم شەڕە بکات چونکە باوەڕی بەستافی مەڵبەندی یەک، بە سەرۆکایەتی مەلا بەختیار، لاوازبوو. لەگەڵ مەفرەزەیەکی گەورەی خۆیان ڕوویکردە شارەزوور. لە ۱ / ۱ / ۱۹۸۱دا، لە دۆڵی گەڵاڵ دەوروبەری قەڵای سروچک لووتیان تەقی بەلوتی مەفرەزەی حسک و ئەومەفرەزەیەش لەگەڵ محمدی حاجی محمود بوو. کە بە فەرمی هێشتا لەگەڵ یەکێتی بوو، بەڵام بەکردەوە دابوویە پاڵ حسک. شەڕ گەرم بوو، چەندین سەعات درێژەی کێشا. دوایی کۆتایی هات بە تێشکانی هێزەکەی ینک و پاشەکشەیان بۆ دواوە.

نەیارانی یەکێتی، پاش شەڕەکە، زانیاریان لەکەسانی سەربەخۆیان دەستکەوت کە بەر پرسێکی یەکێتی نەیتوانیوە پاشەکشەبکات و لەو ناوە ماوە.کەوتنە سۆراخێکی چڕوپڕ بەشوێنیدا. لەوسۆراخەدابوون کەنامەیەکیان لە نەوشیروانەوە ئاراستە کرا بە بەرواری پێش ۳ ڕۆژ لەوەوبەر لە نێوزەنگەوە نوسراوە، هەڕەشەیان لێدەکات ئەگەر وازنەهێنن ئەیکات بە شەڕی سەرتاسەری کوردستان لە دژیان.

له ٤ / ١ دا چەکدارانی حسک نەوشیروانیان گرت لە ماڵی حاجی علی قەویلە – گوندێکە نزیکی سیدسادق – بێ شەڕو تەقە. لەناو بەرپرسانی حسکدا دووڕا هەبوو، یەکێکیان لەگەڵ کوشتنی بوو ئەویتر دژبە کوشتنی. خۆیشی داوای کرد وتی:

-مەمکوژن، وەعدی پیاوبێ ئەچمە دەرەوەو واز لە هەموو شت دەهێنم.

لەم سەروبەندەدا نامە یەکیتر لە مەلا بەختیار و بەرپرسانی مەڵبەندی یەکەوە هات پڕ لە هەڕەشە بۆ حسک نەگەر نەوشیروان شتێکی بەسەر بێ بە مێختانا نە چینە خوارەوە. نامەکەیان دابەدەستی نەوشیروان. کۆمێنتی ئەویش ئەوە بوو وتی:

- خۆتان دەزانن ئەوان ڕقیان لە منە، بۆیە ئەم نامە یان وەها توند نوسیوە هەتا پاڵ بە ئێوەوە بنێن بمکوژن. زۆری نەخایاند نامەی سێهەم لە بەغداوە هات. بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی ڕژێمی فاشی فازیل بڕاک لەونامەیەدا ( ٣ ) خاڵی خستبوەبەردەمی سەرکردایەتی حسک:

١- خۆیان نەوشیروان بکوژن.

٢- یان تەسلیمی ڕژێمی بکەن.

٣- یان ڕێکەون لەگەڵ ڕژێمی سەدام لەسەر تەرتیباتێ کەنەوشیروان ببەن بۆ جێگەیەک و لەرێگە کەمینێکی حکومەت پەلاماریان بدات و نەوشیروان بگرێت و ئەوانیتر ڕاکەن. بەرانبەر بەهەر کام لەم ٣ پێشنازە حسک هەرچەندە داوابکات حکومەت ئامادەیە بیدات.

لە ڕۆژی ١/٣ دا، هێشتا بەرپرسانی حسک لە قەویلەبوون، کە چەکدارانی یەکێتی هاتن و دەستیان بەتەقە و شەڕکرد لەسەر قەویلە و هێندێ جێگەیتری ئەو ناوە. مەفرەزەیەکی حسک بەسەرۆکایەتی محمەدی حاجی مەحمود لەپشتەوە سەرکەوت و ٩ کەسی لەو هێرشکەرانە بەدیل گرت و بردیانن بۆ لای نەوشیروان لە قەویلە. کە

زانیان نەوشیروانیش گیراوە زێتر ورمیان دابەزی. یەکێکیان ڕووی کردە نەوشیروان وتی :

-ئێوە لەپێناوی چیدا ئەم شەڕەمان پێدەکەن؟

پاشتر هەموو دیلەکان گوازرانەوە بۆ بارەگا لە سورێن و سیجن کران.

* * *

دوور لەدۆڵی گەلاڵ و دوور لەشاخی سورێن، لەدۆڵی نێوزەنگ و زەڵێ پێوەندی و چالاکیەکی چڕوپڕ هاتەکایە سەبارەت بە پرسی گرتن و بەردانی نەوشیروان. ئەو کاتە سکرتێر و زۆرینەی ئەندامانی سەرکردایەتی حشع لەدەرەوەی وڵاتبوون. بەرپرسی هەموو کاروبارێکی سیاسی و سەربازی کۆمیتەی ڕێخراوی هەرێم بوو کە لەنێوزەنگ بوو، لەتەنیشت سەرکردایەتی ینکەوە. لە ینکیش تالەبانیش لەدەرەوەی وڵاتبوو. جێگرەکەیشی نەوشیروان مستەفا گیرابوو لای حسک، کۆچکردوو کەمال خۆشناو کەسی یەکەمبوو کەبە هەڵەداوان هات بۆ بارەگای ئێمە، وتی :

-فریامان کەون ! حسک نەوشیروانیان گرتووە، ترسمان هەیە بیکوژن.

ئێمەش بەفەوری نامەمان نارد بۆ سەرکردایەتی حسک لە گوڕەشیر، کەزۆر دوورنەبوو لە زەڵێوە، داوامان لیکردن کە : یەکەم ژیانی نەشیروان پارێزراوبێ و دووەم بەریدەن. وەڵامی حسک ئەوە بوو کە نەوشیروان گەلێ دەستریژی کردۆتە سەریان، بەفەرمانی ئەو زۆریان لێکوژراوە سەدانیان لێ چەککراوە. دەبێ حسابی لەگەڵ بکرێ و قەرزەکانی حسک بدرێتەوە ئینجا قسە لەسەر بەردانی بکرێ.

ئالوگۆڕی نامەو ئەم سەر و ئەوسەر بەچڕی بەردەوام بوو لەسەر بەردانی نەوشیروان. ڕۆژێکیان کمال خۆشناو هات وتی :

-ترسی زۆرمان هەیە کە نەوشیروان لە بەندینخانەی حسک بیانوویەکی بۆ سازبکرێ گوایە هەوڵی ڕاکردنی داوە یان شتێکی لەو

بـــابەتە. لەبەر ئەوە تكاتـــان لێـــدەكەین بەشـــكو داوا لەحـــسك بـــكەن بانەوشـــیروان بگـــوێزرێتەوە بـــۆ بارەگـــای ئێـــوە لە ســـورێن تـــا پرســـەكەی دەكەوێ بەلایەكدا.

ئێمەش ئەمەمان لاپەسەند بوو، داواكەمـان خستە بەردەم سەركردایەتی حسک. ئەوانیش قایلبوون بەم داخوازیە و ئەوشیروان لە سجنی حسكەوە گـوێزرایەوە بـۆ بارەگـای حـشع لە سـورێن. ئەو مـاوەیەی لەوێ بـوو رێزلێگیرا و بێ هیچ سانسۆرێ كاتی بەسەردەبرد. لەنێوزەنگیش هەوڵ وكۆششی حشع بەردەوامبـوو بـۆ بەردانـی. گوشـارمان لەسـەر حـسك توندتركرد، بەرەسول مامەند گوترا :

-پەیوەندی حشع لەگەڵ ئێوەدا گرێدراوە بەم پرسەوە، ئەگەر ئەوشیروان بەرنەدەن پێوەنـدیمان دەپچـڕێ. دوای ئەم هەڕەشـەیە حـسك ئاگـاداری كردین كە بڕیـاری بەردانـی ئەوشیروانیاندا. بەپەلە ئەم هەواڵە نێردرا بۆ كەمال خۆشناو. ٣ كەس ئامادەكران كە نامەی سەركردایەتی حسك بەرن بـۆ سـورێن و ئەوشـیروان لەگەڵ خۆیـان بێنـنەوە بـۆ ناوزەنـگ، لە حشع ابو شوان ( قادر رەشید ) و لە ینـك جمال حكیم و لە حـسكیش برادەرێك.

رۆژی سێهەم لە رۆیـشتنی ئەم ٣ نێردراوە، لە كاتێكدا كە مـاوەیەكی كەم مـــابوو بـــگەنە ســـورێن، لەبارەگاكـــانی یەكێتـــی لەنێوزەنـــگ تەقەكردنێكـی چڕ دەستپێكرد، زێتر لە ملیۆنێ فیشەك تەقێنـدرا. شـیوعیەكان نەیـانزانی ئەم تەقەیە بۆچی، كەسـۆراخیان كـرد دەركەوت ئەمە تەقەی خۆشیە بە بۆنەی ڕاكردنی ئەوشیروانەوە، دوایـی دەركەوت شێخ كاوەی حەفید یارمەتیداوە بۆ ئەم ڕاكردنە.

له کۆتاییدا چەند تێبینیەک هەیە دەبێ بوترێ.

١- بە گوێرەی داب و نەریتی کۆمەڵایەتی حشع، کە نەوشیروانی لە سجنەوە گواستبۆوە بۆ بارەگاکەی خۆی، مانای وایە بوو بوو بەکەفیلی. بەلای زۆرەوە نەوشیروان ئاگاداریشبووە کە بڕیاری بەردانی دراوە. لەبەر ئەوە ڕاکردنەکەی بەو شێوەیە نەشتێکی بەجێبوو نە هیچ ئازایەتی تێدابوو.

٢ -پاش ڕاکردن و گەڕانەوەشی بۆ نێوزەنگ، نەوشیروان بەیەک وشەش – ئەوەندەی من بەئاگام – ئەسوپاسێکی شیوعیەکانی کرد لەسەر ئەو هەوڵ و کۆششە یان بۆ ڕزگارکردنی و نەداوای لێبوردنی لێکردین لەسەر ئەو ڕاکردنە لەبارەگاکەی ئەوانەوە بەو شێوەیەی باسم کرد.

٣- لە ١٩٨٣ دا کە سەرکردایەتی هێزێکی سەربازی کرد و هێرشی کردە سەر پشتئاشان، نەوشیروان نە ڕووداوەکانی مانگی یەکی ١٩٨١ ی بەخەیاڵداهاتوو نە تۆزقاڵێک ڕەحمی بە شیوعیەکان کرد. نزیکەی ٦٠ کەسیان لێکوژرا، کە دیلیشیان تێدابوو، ئافرەتیشیان تێدابوو. بەڵێ خودی شیوعیەکانیش خەتاباربوون کە خۆیان خزانە نێو ئەو شەڕە بەڵام ئەمە نەوشیروان لە زیادە ڕەوی و بێوەفایی عەفووناکات.

# جەولەیەکی نوێ لەشەڕی برا کوژی بە بەشداری هەموان (شەڕی پشتاشان)

پێدەچێ سەرکەوتنی پارتی بەناسانی لەشەڕی هەکاریدا سەرکردایەتی پارتی گومڕا کردو پاڵییێوە تا بیر لەوەشاندنی گورزێکی دیکە لە ینک بکاتەوە. لە چوار چێوەی ئەم پرۆژەیەدا سەرکردایەتی پارتی کەوتە جموجووڵ و پەیوەندی لەگەڵ لایەنەکانی جود بە هیوای ڕاکێشانیان بۆ بەشداری لە پرۆسیسەکەدا. سۆشیالیستەکان کە لەوکاتەدا ناوی خۆیان نابوو ( حسیک ؛ حیزبی سۆشیالیستی یەکگرتووی کوردستان و ڕەسوڵ مامەند بوو بوو بە سکرتێریان ) بێزار بوون لە دەستدرێژیەکانی ینک. لەبەر ئەوە ئەو بیرۆکەیەی پارتیان پێ پەسەند بوو کە گەلە کۆمەیەکی سەربازی بکرێتە سەر ینک. سەبارەت بە حشعیش چەند هاوڕێیەکی عەرەب لەوکاتەدا لە پشتا شان بوون، سەریان لە هیچ دەرنەدەکرد و وەکو نەبوو وابوون. ٣ هاوڕێی کوردیشی لێبوو لەسەرکردایەتی کە بریتیبوون لە جێگری سکرتیر کریم احمد و ئەندامی مەکتەب سیاسی عومەر علی شێخ و ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی احمد بانی خێلانی. بڕیار بەدەستی ڕاستە قینە ئەم سیانە بوون لەگەڵ سکرتیری حشع عزیز محمد کە لە مۆسکۆ دانیشتبوو. ئەمانە حشعیان ڕاپێچی شەڕی براکوژی پشتاشان کرد. ئەمانە لەبیریان چوبوو بۆچی لیژنەی هەرێم لەساڵی ٩٨٠ دا بەرەی جود یان دروستکرد. ناڕەحەت بوون لەوە کە چوار ساڵ بوو حشع لە پاشکۆی سەدام دا نەمابوو، دەگەڕان بۆلایەکی تر بچنە پاشکۆی.

پاسۆکیش ـ نازانم بۆچی ـ بە حەماسەوە خۆی خزانە ناو ئەم بەرە نا بەجێیە. بەم شێوەیە چوار لایەن کۆکرانەوە لەبەرەیەکدا بۆ هێرش بردنە سەر ینک.

مەڵبەندی هەولێری حشع کە یوسف حنا القس بەر پرس بوو خۆی ئامادە کردبوو بۆ ئەو هێرشە. لە ڕۆژی ٢٨ / ٤ /٩٨٣ بروسکەم بۆهات کە هێزەکانی جود ئەمرۆ دەستی گرت بەسەر بارەگای مەڵبەندی ینک دا لە گوندی بالیسان. لەو کاتەدا بارەگاکانی مەڵبەندی سلێمانی و کەرکوکی حشع لەگەڵ مەڵبەندی یەکی ینک هەردو لە گوندی حاجی مامەند بووین لە شار بازێڕ. پەیتا پەیتا لەسەر کردایەتی هەردولامانەوە بروسکە مان بۆ دەهات. داوایان لە من دەکرد لەوان بدەم و داوایان لە مەلا بەختیار دەکرد لە ئێمە بدات. ئێمە ڕێکەوتبووین کە شەڕ نەکەین و هەر نەمان کرد. پەیوەندیشمان لەگەل یەکتر نە بچڕی. دواتر هەردووکمان سزا دراین، دەرکراین لە پۆستەکانمان، بەلام شانازی و سەر بەرزیمان بۆ مایەوە.

با بچینەوە بۆ بەشی ئەولای شەرەکە . کە ئەوشیروان مستەفا، جێگری سکرتیری گشتی ینک، هێرشی جود و گرتنی بارەگای مەڵبەندی ینک ی بیست لە بالیسان بڕیاری فەوری تۆلە سەندنەوەی دا. یەکسەر کەوتە کۆکردنەوەی ئەو پێشمەرگانەی بۆی کۆکرانەوەو کەوتە ڕێ بەرەو پشتاشان کە بارەگای سەرکردایەتی حشع و حسیک و پاسۆکی تیدا بوو بەڵام پارتی تیدا نەبوو، سەرکردایەتیەکەیان لە ڕاژان ( نزیک شاری ورمێ ) بوو لە ئێران. بەرە بەیانی ١ / ٥ / ٩٨٣ ئەوشیروان بە هێزەکەیەوە گەیشتنە پشتاشان و شەڕ یەکسەر دەستی پێکرد. ئێوارەی ئەوڕۆژە ینک پشتاشانی گرت و کوژراوی شیوعیەکان دەوری ٦٠ کەس بوو لە حسکیش ١٢ پێشمەرگەیان کوژران. ئەوەی ناخۆش بوو بەتایبەتی ئەوەبوو کە ( وەک وتیان ) ژمارەیەک لەدیل گیران، ( ئافرەتیشیان تێدا بوو ) دواتر بە فەرمانی ئەوشیروان مستەفا کوژران. من دڵنیام لەوە کە لە شەڕی برا کوژیدا

یەکێتی و پارتیش دیلەکانیان دەکوشت و نەوشیروانیش یەکێک بوو لە بەرپرسە سەرەکیەکانی ئەم تاوانە.

سەرکردایەتی و کادرو ئەندامانی حشع کە لە کوشتن و گرتن رزگاربوون سەرکەوتن بۆ سەر قەندیل و زۆر بەناڕەحەتی شۆڕبوونەوە بەودیودا بۆ ناو ئێران. بەڵام ئەو دوانە کە لە هەموو کەس بە جەماستر بوون بۆ شەڕەکە و هەموو ڕۆژێ برووسکە یان دەنارد بۆ مەڵبەندی ئێمە، داوایان لێدەکردین تەنسیق بکەین لەگەڵ پارتی و سۆشیالیست بۆ لێدانی ینک، کریم احمد و احمد بانی خێلانی، لەباتی بچن بەودیودا هاتنەوە بەم دیودا بۆ دەوری قەسرێ. لەوێ پێشمەرگەی یەکیەتی گرتنی بەدیلی ناردیانن بۆ بارەگای تاڵەبانی لە نیو زەنگ. هەردوکیان ڕووخابوون, لەگەڵ گەیشتنیان بە بارەگای تاڵەبانی بەیانێکیان نووسی، لەسەر ۱۸۰ پلە پەشیمان بوونەوە لەو ڕێڕە وو بۆ چوونەیان کە هەتا ۱/ ٥ یش بانگەوازیان بۆ دەکرد، داوایان لە شیوعیەکان کرد کەواز بێنن لە شەڕی برا کوژی لەگەڵ پێشمەرگەی ینک بکەونە جەولەی هاوبەش و عەمەلیاتی هاوبەش دژ بە حکومەتی سەدام.

هاوڕێیانی سەرکردایەتیش کە چوونە ئەودیوی قەندیل لەباتی چاوخشاندنەوە بە سیاسەتی چەوت و هەڵەی کوشندەیاندا کەوتنە هەوڵ و تەقەلای چرپڕ بۆ دۆزینەوەی پاساوێ بۆ بەشدارییان لە شەڕی حیزبە نەتەوەیەکانی هەرێمدا و پاساوی تێشکانیان لە پشتاشان. بەهیچ شێوەیەک پاساوی سیاسی لۆژیکیان دەستناکەوێت. دەبا بەهادین نوری بکەن بە قوربانی چونکە پێشمەرگەی نە نارد لە شاخی هەورامانەوە بۆ پشتاشان. هەرچی نەختێ شارەزای جوگرافیای ناوچەکە و دۆخی سیاسی وڵات بێت لەو ڕۆژانەی شەڕی پشتاشاندا دەزانێ هیچ لۆژیکێ لەم پاساوەدا نیە.

بەس پاساوێکی تریان هاتە دەست. مەلاعلی ( عبدوللەی مەلا فرج ) کە بەر پرسی سەربازی مەڵبەندی سلێمانی بوو، نێردرا بە سەرۆکایەتی شاندێکی سێ کەسی بۆ دانوستان لەگەڵ شاندی مەڵبەندی یەکی ینک لە گوندی دێوانە، بەهیوای ڕێکەوتنێکی هاوسەنگ کە لە شارەزوور ئێمە لە ڕۆژهەڵاتی جادەی عەربەت ـ دەربەندیخان و ئەوانیش لە ڕۆژئاوای جادەکە، لەگەڵ پەیوەندیەکی ئاشتیانەی ئاسایی لە نێوانماندا. تاکیدیشم لەسەرکردن کە دەبێ هیچ ڕێکەوتنێ واژۆ نەکرێ پێش گەڕانەوە بۆلای خۆمان و ڕەزامەندیمان. بۆ ئاگاداری نزیکەی یەک دو کم گوندی دێوانە لە ئێمەوە دوور بوو، مەلا علی لە منی شاردەوە کە پرۆژەیەکی لای خۆی گەڵاڵە کردوە سەبارەت بە ڕێکەوتن لەگەڵ ینک. گومانیشم هەیە بەهاوکاری نهێنی لەگەڵ هێندێ کەسی ینک ئەمەی کردبێ. زیتر ئەوە ئەم گومانەی لا دروستکردم کە :

- من سەر قەڵەمی داخوازی خۆمانم نوسیبوو،دابوومە دەست شێخ سعید بەرزنجی بۆ ئەوەی بیداتە مەلا عەلی، بەڵام مەلا بەیەک پیتیش نە چووبوو بەلایدا.

- داوام کردبوو کە بگەڕێتەوە بۆلای خۆم پێش واژۆکردنی هیچ بەڵگە نامەیەک، مەسافەش لە ئێمەوە بۆ گوندی دێوانە نزیکەی دوکم بوو.

- پاش واژۆکردنی بەڵگە نامەکەش مەلا ٢٤ سەعات خۆی لەمن شاردەوە هەتا چەندین جار ئەوبەڵگەنامەیە لە ڕادیۆکەی ینکە وە بخوێنرێتەوە.

من بە دڵسۆزی پەرۆشی ڕێکەوتن بووم، بەڵام لە نێوان دوحیزبی سەربەخۆکە هیچیان پاشکۆی ئەویترنەبێ. دەرکەوت مەلا بەشێوەیەکی کە بیری لە پرسەکە دەکردەوە. هەستم نەکرد شەری برا کوژی بوێ،

بەس حەزی لە پاشکۆ گەری هەبوو. ئەوکردی ومن باجەکەم دا، ئەگەر چی خۆیشی سزادراو هەردوکمان لە مەڵبەندی سلێمانی و کرکوک دوورخراینەوە. بۆ ئاگاداری ئەوانەش ئێمەیان سزادا کە خۆیان حشعیان گەیاند بەمەدەردەی ئێستەش پێوە دەناڵێ، بەڵام هیچ لێ پرسینەوەیەک لە خۆیان نەکرا.

لاپەڕەی سەرەکی لەم جەولەی شەڕی براکوژی، کە سکرتێری حشع عزیز محەمەد و جێگرەکەی کریم احمد شیوعیەکانیان تێخزاند، کۆتایی هات بەسەرکەوتنی ینک و دۆڕانی جود. ینک بەتەنیا لە گۆڕەپانی ناوچەکانی سلێمانی و هەولێرو گەرمیان مایەوە. بارەگاکانی حشع و حسک بەشاخی هەورامانەوە مانەوە، بەڵام لەساڵی ٩٨٤ وە مەگەر بە نهێنی مەفرەزەیان دابەزاندایە بۆ دەشتی شارەزوور. قورسایی دوڕانەکە بە حشعەوە زەقتر دەبینرا، نزیکەی ٩٠ (نەوەد) هاوڕێی پێشمەرگە، کە زۆریان کادربوون، کوژران و هەموو چەک و کەلوپەلەکانیان تێدا چوو. حسک و پاسۆکیش زیانیان زۆر بوو، بەڵام خودی پارتی زیانی کەمتربوو چونکە هیچ بارەگایەکی لە پشتاشان نەبوو، نازانم قەبارەی بەشدارییان لەشەڕدا چەند بوو، تاکەی بوو؟ بارەگای سەرکردایەتیان لە مێژەوە لە ئێران بوو نزیک ورمێ. لەناو هەرێم دا بادینان بەدەست ئەوانەوەبوو. سەرکەوتنی ینک لەشەڕی ٩٨٣ قەرەبووی دۆڕانی ٩٧٧ ی هەکاری بۆ کردنەوە، ورەی پێشمەرگەکانی بەرزکردەوە، بەپێچەوانەی ورەی پێشمەرگەی چوار لایەنەکە یتر. ینک لەلایەک و چوار حیزبەکەی جود لە ٩٨٣ وە بۆ ماوەی پێنج ساڵ لە حاڵەتی جەنگدا مانەوە، ڕاوی یەکتریان دەکرد.

شەڕی برا کوژی و کوشتن لەشاخەوە بە شێوەی نهێنی گوێزرایەوە بۆ ناو شارەکان کە لە ژێردەستی ڕژێمی سەدامدا بوون. لە شارەکانیشدا ڕێخستنی نهێنی ینک بە هێزتربوو. لەبەر ئەوە چالاکیەکانی ینک

زۆرتربوو چ لە کوشتنی سیخوڕو جاشەکان چ لە کوشتنی ئەندامی حیزبی ناحەز. هاوڵاتیانی ئاسایی زۆر دڵگران دەبوون لە کووشتنی هەرکەسێ بە هۆی ناکۆکی حیزبەکانەوە لەناو خۆیاندا. لێرەدا دەبێ بوترێ کە خەتاباری سەرەکی لە کوشتنی ئەندامانی حیزبەکان لەناوشارەکاندا وەک لە شاخەکان ـ سەرکردەکانیان بوون. سەرکردایەتی پارتی و ینک و ڕەنگە حسکیش، هەریەکە لیژنەی ئیغتیالاتی خۆی هەبوو لە ناوشارداو جێبەجێکردنی کوشتنیش بە نامەی سەرکردایەتی حیزب دەکرا. ئەو حاڵەتانەش هەبوو کە کۆمەڵێ کەسیان بەیەکێ دەکوشت و پاشتر خودی ئەو بکوژەشیان دەکوشت ئەوەک جێیان بهێڵێت و دوایی نهێنی ئەو کوشتنانە دەربخات.

# ئاگربەستی نێوان یەنك رژێمی سەدام کاریگەری دەروونیشی هەبوو

پاش سەرکەوتنەکەی یەنک لە جەولەی شەڕی برا کوژی ۱۹۸۳ سەرکردایەتی یەنک ئاگر بەستێکی لەگەڵ ڕژێمی فاشی بەعس ڕاگەیاند. نازانم ئەمە بە چی مەبەستێ بوو چونکە تاڵەبانی سەدامی باش دەناسی و ئەزموونێکی تاڵی لەگەڵیدا هەبوو. لەو ڕۆژانەدا ترازووی هێزلەنێوان ئێران و عێراق دا، لە جەنگەکەیاندا، کەمێ گۆڕابوو لەبەرژەوەندی ئێران. ڕەنگە ئەمە هۆکارێ بووبێ کە سەدام ناچار بکات بە ئاگر بەس و دانوستان لەگەڵ کورد. بە هەرحاڵ بێ سەرکردایەتی یەنک خوێندنەوەیەکی هەڵەی هەبوو بۆ ئایندەی وەزعی کوردستان، لەوە حاڵی نەبوو کە ڕێگەی سەرکەوتنی کورد لەدۆخی ئەوکاتەدا ڕێگەی یەکگرتنی هێزەکانە نەک ڕێگەی قۆرخکردنی دەسەڵات.

من بێئاگام لەوردەکاری پێوەندیەکانی نێوان یەنک و دەسەڵات و دانوستان و مامەڵەیان لەگەڵ یەکتر لەو ڕۆژانەدا. بەڵام پێم وایە کە ئەو ئاگر بەستە زیانی لە قازانجی بۆ کورد زیاتر بوو. ڕەنگە یەنک هێندێ دەسکەوتی حیزبی تەسکی بۆ خۆی بەدەست هێنابێ لە پوول وپارە وتەقەمەنی و شتی لەو بابەتە. بەڵام هەر لەو ڕۆژانەشدا، لەو بارودۆخەدا کە ئاگربەس خوڵقاندی، دەسەلاتی بەعس کەڵکی لە دۆخەکە وەرگرت و کەوتە دامەزراندنی ژمارەیەکی زۆر لە ( ئەفواج خەفیفەی ) جاش کە لە سلێمانی دا ناونرابوون ( جاشی میچکە ). زووتر وشەی ( جاش ) لەناو کوردا وشەیەکی پڕ لە عەیب وئابڕووچوون بوو. بەڵام، لەدوای ئاگر بەس، پێشمەرگەو جاش لە شارەکاندا پێکەوە دەبینران ئەو شەرم و عەیبەیەی جاران لەوشەی جاش نەما، خەڵکێکی

زۆر چونە ریزەکانی ( ئەفواج خەفیفە ) بەتایبەتی لە ژێر گوشاری هەژاری و بێنیشیدا. ئەمە تەنها دیاردەیەکی سەربازی نەبوو، بەڵکو تاسیرێکی قووڵی دەروونی ـ ڕەوشتیشی بەدوای خۆیدا هێنا.

لەکۆتایدا ئەم ئاگر بەستە هیچی لێنەڕواو، ینک کۆتایی پێهێنا بە هێرشێکی سەرکەوتوو بۆ سەر ڕەبایای سوپای سەدام لەسەر شاخی دابان ورزگار کردنی ئەو شاخە ( پشتی پیرەمەگروون ).

# جیابوونەوەی ئالای شۆڕش و سجنی مەلا بەختیار و پشکۆ و خولە کەشکۆڵ لە ١٩٨٥

پاش ١٠ ساڵ لە دامەزراندنی ( یەکێتی ) یەکەم لەتبوونی گەورەی بەخۆیەوە دی . جیا بوونەوەی ئاش لە ساڵی ٩٨٥ دا. یەکەم پرسیار کە لێرەدا دێتە پێش : هۆکاری ئەم جیابوونەوە چیبوو؟ خیلافاتی ئەوانە لەگەڵ یەکێتی چیبوو؟

رەگو ریشەی خیلافات و لەتبوونی ئاش دەگەرێتەوە بۆساڵانی حەفتاکان، ئەو کاتە کە شانە سەرەتاییەکانی کۆمەڵەی مارکسی - لینینی لە کوردستاندا دامەزرێنرا. لە هێندێ کەسم بیستبوو کە تاڵەبانی خۆی دامەزرێنەری کۆمەڵەیە، بەڵام لە گوماندابووم کە ئەمە راستبێ تاساڵی ١٩٨٦ کە چوومە بارەگای تاڵەبانی لە یاخسەمەر - شارباژێڕ . لە گفتوگۆیەکی دووقۆڵی باسمان لەسەر زۆرشت کرد. لەو دانیشتنەدا تاڵەبانی وتی : ( منیش ماویەک ماوی بووم ). لەوقسەیەوە گەیشتمە یەقین کە راستە، تاڵەبانی خۆی دامەزرێنەری کۆمەڵە بووە لە ژێر کاریگەری بیرو بۆچونی ماویزمدا. نازانم بۆ چەند ساڵ تاڵەبانی بە فکری ماویزمەوە مایەوە، بەڵام دڵنیام ئەوکاتە پەیوەندی روحی لەگەڵ ماویزم نەمابوو چونکە لەو کاتەدا مە لا بە ختیار کەبەرپرسی ئاش بوو لە پارێزگای سلێمانی لە خودی یاخسەمەر بەند کرابوو. ( دواتر باسی ئەمە دەکەم ).

شایانی باسە لەوکاتەدا کە تاڵەبانی لە پێگەی فکری نەتەوەییەوە گواستیەوە بۆ پێگەی مارکسی - ماوی چەندین حیزب و کۆڕو کۆمەڵ لە وڵاتانی جیاجیا دا ئەم جۆرە گواستنەوەیان ئەنجام دابوو. لە شەستەکان و حەفتاکانی سەدەی بیستەم دا. نمونەی ئەمەش فیدڵ کاسترۆ لە کوبا، حیزبی سۆشیالیست لە باشوری یەمەن، بەرەی میللی

و بەرەی دیموکراسی لە ناو فەلەستینیەکاندا، هێندێ لە ناسریەکان لە عێراق و وڵاتی دیکەشدا.... هتد. لەناو کوردیشدا تاڵەبانی و باڵی لەحیزبی دیموکراتی کوردی ڕۆژهەلات و پ ک ک و.... هتد.

کە تاڵەبانی کۆمەڵەی مارکسی ـ لینینی کوردستانی دامەزراند نەیویست خۆی بخاتە ڕوو. وەهای پێباش بوو خۆی لە پشتی پەردەوە بێ وەکو سکرتیری یەکێتی کە لە ٣ بەش پێک هاتبوو، کۆمەڵە کە نەوشیروان مستەفا سکرتێری بوو + شۆڕشگێڕان کە د. فوئاد معصوم سکرتێری بوو + خەتی پان کە ڕیخستنی تێدا نەبوو، کۆمەڵێ ناغاو شەخسیات بوون تەرتیبێکی پێکهێنابوو بۆ پەیوەندی لەگەڵ هەرکەسەو بەشێوەیەک. کاتێ کە ماوی بوو تاڵەبانی هیوای زۆری خسبووە سەر کۆمەڵە، نەوشیروان مستەفای کردبوو بە سکرتێری. لە نیوزەنگ ساڵی ٩٨١ لەگەڵ نەوشیروان لە خێوەتەکەی ئەو دوو قۆڵی دانیشتبووین. لێمپرسی:

. تۆ وەکو سکرتێری کۆمەڵە ڕات چیە بەو ڕێخراوە، چۆنی هەڵدە سەنگێنیت؟

ـ من قەناعەتم بەم ئیشە نیە . نەوشیروان وتی ـ ئەمە مام جلال سەپاندویەتی بەسەرمدا.

منیش قەناعەتم کرد کە ڕاستی کرد. دەیویست خۆی تەرخانکات بەس بۆ کوردایەتی.

لە حەفتاکاندا کە کۆمەڵە دامەزرێنرا ژمارەیەکی زۆر لە لاوانی کورد بە حەماسێکی بەرزەوە چوونە ڕیزەکانی کۆمەڵەی مارکسی ـ لینینی - هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ :

١. هەڵویستی چەوتی حشع پاش هەڵبژاردنی عزیز محمد بە سکرتێر لە ٩٦٤ دا و خۆبەستنەوە بە بەرە کلکا یە تیەکەی لە حەفتاکاندا لەگەڵ ڕژێمی سەدام و پشتکردنە میللەتی کورد لە ڕۆژانی سەختی ئاشبەتاڵی ٩٧٥ دا... هتد

٢ـ کاردانەوەی لاوانی کورد دژ بە دارمانەکەی ٩٧٥ و حەزو ئارەزوویان لەوە کە کوردایەتی و زیندوکردنەوەی خەباتی چەکداری دارماو گریدەن لەگەڵ خەباتی هەژاران لە پێناوی یەکسانی و عەدالەت لەسایەی ڕژێمی سۆشیا لیستیدا. هیچ ئامادەکاریەکی جدی لە یەکێتیدا نەبوو بۆ تەسقیفی ئەو لاوانەی دەهاتنە ناو کۆمەڵەو خۆشیان هیچ شارەزاییەکیان نە بوو لە تیۆری مارکسیدا. هەرئەوەندەیان دەزانی کە ئامانجی کۆتایی مارکسیستەکان دامەزراندنی سۆسیالیزمە. تاکو تروکێکیان نەبێ کە بۆیان ڕێکەوتبوو شت فێربین و شت بخوێننەوە.

بەهەر حالێ ئەو لاوانە بە ئاسانی ڕاکێشران بۆ ریزی، کۆمەڵە خۆیان خۆبەخشانە دەهاتن، بەڵام کەس نەیدە توانی بەهەمان ئاسانی دایانبڕێ لە کۆمەڵە. لێرەوە کێشەی کۆمەڵە لەگەڵ سەرکردایەتی یەکێتی ( یان لەگەڵ تاڵەبانی ) پەیدا بوو، لێرەوە ڕەگو ریشەی خیلافات هاتە ئاراو فکری جیابوونەوە کەوتە نەشونما. مەلا بەختیار کە بەرپرسی ڕێکخراوی کۆمەڵە بوو لە پارێزگای سلێمانی هەر خۆیشی بەرپرسی چالاکیەکان بوو لە هەوڵی جیا بوونەوەدا.

یەکێ لە نیشەباشەکانی مەلا بەختیار لە ٩٨٣ دا ئەوە بوو کە بە ئاسانی لەگەڵ مندا ڕێکەوتین کە یاخی ببین هەرکەس لە سەرکردایەتی خۆی و پێشمەرگەکانمان ڕاپێچی ئەو شەڕە نەکەین. بێگومان ڕێکەوتنەکەمان بەدەرنەبوو لەوە کە هەردوکمان چەپخوازبووین، لە ڕوانگەی چەپایەتیشەوە ئەو هەڵوێستەمان وەرگرت و هەردوکیشمان سزا دراین. ئەو سزایەش پاڵنەربوو بۆ مە لا بە ختیار کە لە یەکیەتی

جیاببێتەوە. دیارە کە لە ٩٨٥ دا کە بە خێزانەوە گواستیەوە بۆ گوندی تەکێ پرۆژەی جیابوونەوەی لە مێشکی خۆیدا گەڵاڵە کردبوو. بەڵام من هیچ زانیاریەکی کۆنکرێتیم نەبوو لەسەر پرۆژەکەی هەتا سەفەرێکی کرد بۆسەرکردایەتی خۆیان و بە ڕویەکی خۆشەوە هاتەوە، وتی :

ــ ڕێکەوتین لەگەڵ سەرکردایەتی یەکیەتی. ئێمە لە ڕووی ڕێخستنەوە جیادەبینەوە، لەڕووی سەربازیەوە هیچ جیابوونەوەیەک ناکرێ. گۆڤارێ دەردەکەین بە ناوی ئاڵای شۆڕش . لیژنەی سەرکردایەتیمان ٣ کەسن، من و پشکۆو شێخ علی (خولە کەشکۆڵ).

دیاربوو مەلا بەختیار زۆر دڵخۆش بوو بەم ڕێکەوتنە. منیش پیرۆزبایم لێکرد. شتێکی ئاساییە کراوە ئەگەر شتێ لە دیموکراسی هەبێ. بەڵام لەگەڵ نەبوونی دیموکراسیدا جیابوونەوە لە حیزب تاوانە و سزای قورسی بەدوادا دێت. ئەو ڕۆژە کە مە لابە ختیار سەرگەرمی چاپکردنی ( ئاڵای شۆڕش ) و گواستنەوە بوو بەرەو شارباژێڕ، بۆ بارەگای حیزبی تازەی لە پڕ هێزی چەکداری مەڵبەند بە سەرۆکایەتی جەبار فرمان و شەوکەتی حاجی موشیر هاتنە تەکێ و ئابلۆقەی ماڵی ناوبراویان داو گرتیان و دەستیان گرت بەسەر هەموو شتێکیدا لەو گوندە. نامەیەکیشیان پێنووسی بۆ مەفرەزەکەی کە چەکەکانیان ڕادەستی یەکێتی بکەن. بەم شێوەیە ڕێکەوتنەکەی م ب و سەرکردایەتی ینک پێشێلکراو دەرکەوت کە جیابونەوە لە ینک ( وەک لە پارتی و لە حشعیش ) قەدەغەیە. لەو ڕۆژانەدا دەنگۆیەکیش هاتە ئارا کە نەوشیروان مستەفا لەسەرەتاوە ئاگای لەم ڕێکەوتنە نە بوو، دوایی کە پێیزانی هەڵیوەشاندەوە.

کە لە ٩٨٦ چوومەلای تاڵەبانی گلەیم لێیکرد لەسەرگرتنی مە لابە ختیار و هەردو هاوڕێکەی پشکۆ و خولە کەشکۆڵ، وتم :

ـ بەناھەق ئەوانەتان گرتووە. بەقسەی مە لابە ختیار ئەوان ڕێکەوتبوون لەگەڵتان کە جیابینەوەو ئاڵای شۆڕش دروستبکەن وەکو حیزبێ بۆخۆیان و ھیچ ھێزی چەکدار جیانەکەنەوە. ھێز بە یەکگرتوویی بمێنێ لای ینک. جیابوونەوەی حیزبی مافێکی سروشتی خۆیانە.
تاڵەبانی وەلامی دایەوە، وتی :
ـ مەلا بەختیار داوادەکات بەریدەین و بیبەینە وڵاتێکی ئەورووپی و دوای ئەوەش مووچەی مانگانەی لەسەر ئێمەبێت.
ڕێگەم بدە بچمە لای و قسەی لەگەڵ بکەم . من داوام کرد. تاڵەبانیش یەکێکی بانگ کردو فەرمانی دا بمبەن بۆسەردانی مە لا بە ختیار. پاش ١٠ خولەک گەیشتمە لای. لە ژوورێک کە مەترێک خۆڵی کرابوە سەر لەسەیتەرەی بارەگای خودی تاڵەبانی. لەو ژوورەدا دوقۆڵی کەوتینە قسە، پێموت :
ـ سەرکردایەتی یەکیەتی ژمارەیەکی زۆری لەنامەکەت فۆتۆ کۆپی کردووەو ناردویەتی بۆ ئەم و ئەو.
ـ ئەگەر ئەوەمان نەکردایە ئیعدامیان دەکردین. جا توخوا ئەبو سلام پیاو لە پێناوی چیدا ئیعدام بکرێ؟
ئەم وەڵامە ئالۆزیکیە زۆر پەستی کردم. بەڵام من لێرەدا لەگەڵ حە پسێکدا قسەدەکەم کە بە ناھەق گیراوە. جگە لەمەش خۆی حیزبەکەی خۆی ـ ینک ـ باش دەناسێت و دەزانێت پیاو کوشتن لەلایان ئاساییە.
بابەتی قسەم گۆڕی، پرسیم :
-مامە لە یان لە گەڵتدا چۆنە؟
ـ زۆر باشە، ھیچ عەیبی تێدا نیە.
ـ تاڵەبانی دەڵێ : م ب دەیەوێ بیبەینە وڵاتێکی ئەورووپا و لەوێش مووچەی مانگانەی بدەینێ، ئێمە بەخێویکەین.

- شتی وەهام نەوتووە. با لەم دەرگایەوە بمکەنەدەرەوەو پارەی خواردنی ئەم ماوەیەی سجنیشم لیوەرگرنەوە.

چوومەوە لای تاڵەبانی و هەمموو قسەکانی م ب م بۆ گێڕایەوە. تاڵەبانی وتی :

- ڕاستی ئەوەیە ئەوشیروان پێیداکوتاوە. بڕۆ قەناعەتی پێبکەو هەر ئیستە بەری بدەن. پاش مانگێ م ب و سالار عزیز یەکتر دەدەنە بەرشەق و هەڵدەوەشێنەوە.

ڕۆژی دواتر چووم بۆ بارەگای ئەوشیروان لە گوندی بەرگەڵوو. داوای بەردانی مەلا بەختیارم لێکرد، هەوڵ و مناقەشەیەکی زۆرم کرد بێ سوود بوو، وتی :

- بەری نادەین، باوەڕی پێناکەم چوونکە درۆی زۆر لەگەل کردوین.

پێموت ئەم هەڵوێستە زۆر نابە جێیە و ناهەقە. گەڕامە وە و هیچم پێنەکرا . ئەمەو من خۆم ڕازی نەبووم لە هەڵوێستی م ب. پێموابوو ئەگەر ئەو نامەی پاکانەشی ئەنوسیایە ئیعدامیان نەدەکرد. ئەگەر ئیعدامیش بکرایە نە دەبوو نامەکەی بنووسیایە.

# جەنگی عێراق – ئێران و میللەتی کورد

سروشتی شەخسی سەدام لەبناغەوە سروشتێکی شەقاوەیی بووە، هەمیشە حەزی لەشەڕوو توندوتیژی بووە. لەبیرەوەریەکانیدا بەهەستی خۆشحاڵییەوە باسی بەشداری خۆی لەهەوڵی کوشتنی عەبدولکریم قاسم دەکات لە ١٩٥٩. جا پیاوی وەها بگاتە بەرزترین پۆسیت لە دەوڵەتدا چی لێ چاوەڕێدەکرێ جگە لە توندوتیژی و جەنگ؟ لەدوای هەولی کوشتنی قاسم سەدام عێراقی جێهێشت و چووە لوبنان دەژیا، مووچەی مانگانەی لەهەواڵگری ئەمریکا وەردەگرت، بەرێکەوتن لەگەڵ ئەوانیش چووە ناو پرۆژەی کودەتای سەربازی تەمووزی ١٩٦٨ کە بۆ جاری دووەم حیزبی بەعسی هێنایەوە سەر حوکم. هەرلەسەرەتاوە احمد حسن البکر وەکو دیکۆر دانراو حوکمڕانی فیعلی خودی سەدام بوو. لە ٩٧٩ دا سەدام بەکری بەتەواوی دەرکرد و خۆی لەسەر کورسی سەرۆکایەتی دانیشت. بەرێکەوتن لەگەڵ واشنتۆن و لەندەن بڕیاڕی شەڕی عێراق . ئێران دراو هێرشی سەبازی عێراق لە ٢٢ ئەیلولی ١٩٨٠ دەستی پێکرد. هۆکاری شەڕەکە، سەبارەت بە واشنتۆن و لەندەن، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ڕژێمی ئیسلامی تاران بە مەترسی دەژمێردرا لەسەر بەرژەوەندی ڕۆژاوا.

سەبارەت بە خودی سەدامیش بیرۆکەی دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتیەکی عەرەبی، وەکو ئیمپراتۆریەتی عەباسییەکان، لە مێشکیدا گەڵاڵەبوو بوو. دەیویست دەوڵەتانی ڕۆژهەڵاتی عەرەب کۆبکاتەوە بەسەرکردایەتی خۆی لەو دەوڵەتەدا. ئەمەش هەلێکە هاتۆتە دەست و زلهێزەکانی ڕۆژاوا پشتگیری دەکەن، بەڵکو داوای لێدەکەن ئێران بگرێ. ناوچە نەوتیەکەی ئەهواز و بەشی لەکوردستانی ئێران

بخاته سەر عێراق و دواتر وڵاتانی کەنداوی دەوڵەمەند بەنەوت. ئەوکاتە دەچێتە ڕیزی دەوڵەتە زلهێزەکانی جیهان !

مەلا حکومڕانەکانی شیعەی ئێران سیاسەتێکی دەرەکی هەڵەو وشکیان گرتبووە بەر، پەیوەندیەکانیان لەگەڵ هەموو وڵاتە پیشەسازیەکانی جیهان ئاڵۆز کردبوو. هیچ دەوڵەتێک نەبوو فرۆکەی جەنگیان پێ بفرۆشێ، بە پێچەوانەی سەدام کە چەکی لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژ ئاوا دەکڕی و سوپاکەی پڕچەکبوو. سوپای سەردەمی شا زۆر لاواز بوو بوو، دڵسۆزی بۆ ڕژێمی ئیسلامیش نەبوو. هێزی پاسدارانیش تازە درووستبووبوو، بە گشتی لە گووندنشینە نە خوێندەوارەکان پێکهاتبوو کە بە کلیلی کۆشکی بەهەشتەوە لە گیرفاندا و بەرماڵی نوێژ لەگەڵ خۆدا دەچوون بۆ بەرەی جەنگ.

هەواڵی بەرپابوونی جەنگی عێراق - ئێران مژدەیەکی خۆش بوو بۆ کوردانی عێراق چونکە خۆیان لە ناخۆشیەکی سەخت و ژیانێکی تاڵدا بوون بەدەست صەدامەوە، هەموو گوندەکانی هەرێم هەزاران خێزانی کورد لەشارو گوندی خۆیانەوە گوازرابونەوە بۆشارەکانی باشوورو ڕۆژاوای عێراق، دەیەها هەزار لەناو ئێراندا پەریشان حاڵ و سەرگەردان مابونەوە. گوندنشینەکانی هەرێم بەزۆر خزینرابونە ناو ئۆردوگا زۆرەملێیەکان، سەرگەرمی ئەوەبوون هەریەکە کەپرێ یان ژورێ بۆخۆی دروست بکات. کورد لە نەهامەتییەکی ڕاستەقینەی فرە چڕدا بوو.

لەگەڵ دەسپێکردنی جەنگدا سەدام ناچاربوو سەدان ڕەبایای سەربازی و زێتریش چۆلکات لە ناوچە شاخاویەکانی هەرێم چونکە پێویستی بەو چەکدارانەبوو لەبەرەی جەنگ دژ بە ئێران. ئەمە گووشاری لەسەر مەفرەزەکانی پێشمەرگە کەم کردەوە، بواری جموجۆڵ و مانۆڕی بۆ بەربڵاو کردن. تەنانەت هێندێ لە جوتیارەکانیش کە هێنرابوون بۆ

ئۆردوگا زۆرەملێیەکان توانیان بگەڕێنەوە بۆ گوندە ڕوخێنراوەکانییان لەسەر سنوری عێراق . تورکیا و سەروو کە جە خانوو بکەن و بە نهێنی لەوێ بژین. ئەوەیان پێخۆشتربوو تا لەژێر دەستی ڕژێمی سەدامدا بژین.

جگە لە تویژێ لە جاشەکوردەکان و بەعسی و دانە دانەش لە شیوعیەکان، جەماوەری کوردو شیعەی عێراق بەگشتی دژی سەدام بوون، عەتفیان لەسەر ئێران بوو، هەموو نیشتیمان پەروەربوون، بەڵام خێرو بەرژەوەندی عێراقیان لەڕووخانی ڕژێمی سەدامدا دەبینی، درندەترین و دڵڕەقترین دوژمنی خۆیان لە ڕژێمی سەدامدا بەدیدەکرد. لەناو عەربی سونەشدا توێژێکی بچووک هەبوو لەکەسانی دیموکراتی و نیشتیمان پەروەر کە هەر دژی سەدام بوون. ڕق و کینەی عێراقیەکان دژ بەسەدام پاساویی لۆژیکی خۆی هەبوو :

١ - سەدام دکتاتۆرێکی فاشی زۆر دڕندەترلە هیتلەرو موسولێنی، عێراقی خستە گێژاویی جەنگیی ناوخۆو دەرەکی، کوردستانی کاولکرد، چوار هەزار گوندی ڕووخاند و گوند نشینەکانی دەربەدەر کرد.

٢- یەکەم حکومڕان بوو لە جیهاندا چەکی کیمیاوی بەکارهێنا دژبە میلەتیی خۆی، هەزاران هاوولاتی خۆی - کە بە پێی دەستوور و یاسای نێو دەولەتی دەبوو پارێزگاری لەسەروماڵیان بکات . کوشت لە ژن و مناڵ و گەنج و پیر یان ئیفلیجی کردن.

٣- لەباتی یەکسانی لەنیوان هاوولاتیان، بە پلەی جیاجیا مامەڵەی لەگەڵ دەکردن، پلە یەک عەشرەتی خۆی بوو، پلە دو سونەی عەرەب و پلە سێ شیعەو کورد. لە هەموو ڕوویەکەوە مامەڵەی جیابوو لەگەڵ ئەم خەڵکانە.

جا شتێکی سروشتی بوو، چاوەڕوان کراو بوو کە هاوولاتیانیش بە چاوی دوژمنانە بڕواننە حکومڕانی لەم چەشنە.

بەدەستتێوەردانی دەوڵەتێکی بێگانە ڕژێمەکەی ڕوخێنراو سەدام گیراو بەدەستی عەرەبی شیعە سزای ئیعدامی تێیدا جێبەجێ کراو کورد زۆر بە خۆشحاڵییەوە تەمەشای دیمەنەکەیان دەکرد. ژمارەیەکی کەم لەوانەی کە زەرەر مەند بوون بە لە ناوبردنی دڵتەنگ بوون.

جەنگی عێراق - ئێران بە ۳ قۆناغدا تێپەڕی. لە قۆناغی یەکەمدا سوپای سەدام باڵا دەست بوو، چووە ناو سنوری ئێران و بە شێکی لەشارو شارۆچکەو دیهاتەکانی داگیرکرد. قۆناغی دووەم ئەوەبوو کە هێزی سوپاو پاسداران توانییان هێڵی بەرگری خۆیان بچەسپێنن و ڕێگە لە پێشکەوتنی سەربازی عێراق بگرن. لە قۆناغی سێهەمدا، گەرچی باڵا دەستی لە ئاسماندا هەر بەدەستی سەدامەوە مایەوە، هێزی پیادەی ئێران، کە بەشی کارامەتری پاسداران بوو، نەشو نمای کردوو کەوتە دەرکردنی سوپای عێراق لە ناوچە داگیرکراوەکان و هێرش بردنە سەر هێندێ ناوچەی عێراق. ۱۹۸۸ هێزی ئێران هێرشی کردە سەر شاری بەسرە کەدووەم یان سێیەم شاری عێراقەو بەندەری سەرەکییەتی. سوپای عێراق نەیتوانی ڕوبەڕوی ئەو هێرشە بێتەوە، داگیرکردنی بەسرە بوو بە شتێکی حەتمی ئەگەر سەدام پەنای بە چەکی کیمیاوی نەبردایە بۆ لێدانی هێرشکەرانی ئیران . بە بەکار هێنانی ئەو چەکە سوپای ئێرانی تێشکاو زیانێکی گیانی زۆریشی لیکەوت، چونکە هیچ زانیاریەکی نەبوو لەسەربوونی ئەوچەکە لای سەدام، لەبەر ئەوە هیچ ئامادەکاریەکی نەکردبوو بۆ ڕوداوێکی لەم جۆرە. لەوکاتانەدا کە مەلا حکومڕانەکانی ئێران سەرگەرمی دابەشکردنی کلیلی کۆشکەکانی بەهەشت بوون بەسەرشەڕکەرەکانیاندا، سەدام، بەیارمەتی هێندێ لەدەولەتانی ڕۆژاوا، سەرگەرمی دروستکردنی چەکی کیمیاوی بوو بۆ لێدانی سوپای ئیران لەکاتی پێویستدا، بێ گوێدانە ئەوە کە ئەم چەکە قەدەغە کراوە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی.

ئەم هێرشەی ئێران و بەکار هێنانی چەکی کیمیاوی لەلایەن سەدامەوە نامەیەک بوو بۆ دەولەتە زلهێزەکان کە لە پشتی هاندانی سەدامەوە بوون بۆ هەلگیرسانی ئەم جەنگە. ئەوان بەتەمابوون سەدام ئێران داگیرکات و بەش بەشیکەن، کەچی ئیستە دەبێ بەرگری لە ڕژێمی عێراق بکەن هەتا ئێران نەی ڕوخێنێ ! دیارە بە هیچ جۆرێ ڕوخانی ڕژێمی عێراقیان پێ قووبوڵناکرێ. هیچ چارەیەکیشیان نیە جگە لەوەستاندنی شەڕ. ئێرانیش دەیزانی کە دوای تێکشکانەکەیان لە شەڕی بەسڕەدا، ناتوانن جێگە بگرن لەناو عێراقدا. لێرەدا جموجۆڵی جەنگی زەمینی زۆر کزبوو. سەدامیش کەڵکی لە باڵا دەستی ئاسمانی وەردەگرت و فرۆکەکانی هەمیشە لە ئاسماندا بوون بۆمبارانی تاران و شارەکانی ئێران و، داوای کۆتایی هێنان بە جەنگ بوو بەداوایەکی گشتی لەسەر ئاستی جیهان. لە عێراقدا بڕیار بەدەست تەنها سەدام بوو، حیساب بۆ کەسی دیکە نەدەکرا. ئەویش خوازیاری ئاگر بەست بوو، لە ئێرانیش ئایەتوڵا خومەینی بڕیار بەدەستی سەرەکی بوو، مەلاکانی دەورو بەری گوشارێکیچڕیان خستە سەری تا ئەوپەرداخە زەهرەی خواردەوە ـ خۆی وەتەنێ ـ ئاگر بەستی واژۆکرد لە ٩٨٨. پاش هەشت ساڵ لە شەڕێکی بێ پاساویی نا عادیلانە و کاولکاری و خوێنڕشتن کە سەدام حسین هەڵیگیرساند و گەلانی عێراق و ئێران باجەکەیاندا.

# ئەنفال و کیمیاباران

کە ئەنفال دەستی پێکرد مەفارزی چەکداری کورد ٤ . ٥ ساڵ بوو پەیدابوو بووەوە. بەڵام پێدەچێ سەدام هیچ حیسابێکی بۆ ئەمە نەکردبێ چونکە دەیزانی کە لاوازن و ناتەبان و بەشاخەکانی سنوری عێراق . ئێرانەوەن ئەوشەرەی لە ساڵی ٩٨٣ وە کەوتە نێوان حیزبەکان دەرگای داخست لەهەموکردارێکی هاوبەش دژ بەسەدام.

پاش حەوت ساڵ لەشەڕی ئێران . عێراق، لەساڵی ٩٨٨ دا حیزبەکان ئاشتبونەوەیان ڕاگەیان و بەرەی کوردوستانیان پێکهێنا کە دەبوو لە ٩٨٠ وە پێکیان بهێنایە. سەدام کەڵکی باشی لە ناتەبایی و شەڕوململانێی نیوان حیزبەکان وەرگرت وئاگر بەستێکی لەگەڵ یەک ڕاگەیاند لە ٩٨٣ دا. ئەم ئاگربەستە بۆماوەیەک بوو بە فاکتەری پاراستنی پاشەوەی بەرەی جەنگ بۆ ڕژێمی فاشی ڕەگەز پەرست. بەم شێوەیە، لەباتی هەوڵی ڕزگارکردنی ناوچەیەک ( پاریزگایەک یان قەزایەک یان هەرناحیەیەک ) بدەن بەقەد شاخەکانی سنورەوە مانەوە هیچ شەڕێکی ئەوتۆیان نەکرد کە شایانی باس بێ جگە لەشەڕی دابان کە یەک کۆتایی ئاگر بەسەکەی پێهێنا لەگەڵ سەدام.

سەدام هەستی بە گۆڕانی ترازووی هێزکردبوو بەرانبەر ئێران. دەیزانی کە گەیشتۆتە قۆناغێ کەدەبێ هێندێ پاشەکشەبکات و ڕێبکەوێ لەگەڵ تاران. بەڵام هەستی بە هیچ لاوازیەک نەدەکرد بەرامبەر بە پێشمەرگە. ویستی ئاگربەس لەگەڵ ئێران هاوکات بێ لەگەڵ نەهێشتنی هێزی پێشمەرگە. بۆ ئەم مەبەستەش نەخشەی ئەنفالی دارشت.

وشەی ( ئەنفال ) کە سەدام کردی بە ناوی پرۆژە تیرۆرستیە ڕەگەز پەرستەکەی خۆی، لە ئەسڵدا ناوی سورەتێکە لە سورەتەکانی قورعان. مێژوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ١٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر. بەهیچ کلوۆژێ جێگەی نابێتەوە لە چەرخی ئەمرۆی گلۆبال - عەولەمەو نینتەرنێتدا. شارستانیەت و مرۆڤایەتی ئەم سەردەمە پرۆژە تیرۆرستیە ڕەگەز پەرستیەکەی سەدامی پێ قوبوول نیە - وەک بینیمان. پرۆژەی ئەنفال ئەوەبوو کە هەموو ئامرازێکی درندانە بەکاربهێنرێ بە بەکارهێنانی چەکی کیمیایشەوە، بۆ نیبادەی هەموو جۆرە خەباتێکی چەکداری کورد و خنکاندنی تەواوی دەنگی ئۆپۆزسونی کوردانی عێراق + گۆڕینی دیمۆگرافی کوردستان و تواندنەوەی گەلی کورد بەوشێوەیەی سەدام دەیەوێ. بۆ ئەم مەبەستە دکتاتۆری عوجەوی هەرچی پێکرا کردی. بەڵام ئەنجامەکەمان بینی : ئەوی ڕوخێنرا و خنکێنرا خودی دیکتاتۆر بوو کە ئیعدام کراو هەتاهەتایە نەفرەتی مێژووی بە شوێنەوەیە، ئەویشی مایەوەو سەرکەوت گەلی کورد بوو.

ڕۆژانی ئەنفال بەرەی جەنگی عێراق - ئێران ئەختێ هێوربوو، لە جۆرە تەجمیدیەکدا بوو. ئەمە ڕێگەی بەسەدام دا هێزێکی زۆری سەربازی لە سوپاو لە جاشە خاینەکان بباتە بەرەی شەڕ دژی پێشمەرگە. من لەورۆژانەدا لە گوندی تەکیەی قەرەداغ بووم، وەکوشایەتحاڵ بەشێ لە ڕوداوەکانی ئەنفالم بینی و دەتوانم قسەیان لەسەر بکەم : هێزی سەرەکی پێشمەرگە لە پاریزگای سلێمانیدا پێشمەرگەی ینک بوو. بارەگای سەرکردایەتی یەکیەتیش لەوکاتەدا لەناوچەی شار بازێڕ - دۆڵێ - بوو. یەکەم هێرشی سەرەکی سەدام بۆسەر ئەو بارەگایانە بوو. قادری حاجی علی کە ئەوکاتە بەرپرسی یەکەمی مەڵبەندی یەکی ینک بوو، بارەگای لە گوندی بەلەکجاڕ - قەرەداغ - بوو، خۆی و پێشمەرگەی چوون بۆ دۆڵی، بۆ بەرگری لە سەرکردایەتی

حیزبەکەیان. شەڕی دۆڵێ بەردەوام بوو کە لە دەربەندیخانەوە هێزی سەدام هیرشی هینا بەرەو مەلبەندی یەکی ینک. جەمیل هەورامی ئەندامی مەڵبەندی ینک پێشمەرگەی خۆیان و لایەنەکانی دیکەشی کۆکردەوە، کە زۆرنەبوو ئاشتببونەوە، چوونە سەرزەردە، بەرەنگاری دوژمن بوونەوە. هێندیکیش لە شاخی ناو تاقەوە بەرەنگار بوونەوە، چەند ڕۆژێ بەرهەڵستی کرا بەلام تەرازوی هێز لە بەرژەوەندی حکومەت بوو، سەرشاخی زەردە گیراو بەوەش چارەنووسی شەڕی قەراخ دیاری کرا. لە ٣١ ی ئازاردا شەش ڕەبیەی سوپاو جاش بەسەر ساخی سێوسێنانەوە بە کۆپتەر دابەزێنرا.

لەو ڕۆژەوە پێشمەرگە کشانەوە بۆ ناو قۆپی قەراخ. هێندێکیش لە پێشمەرگەکان ڕویان کردە گەرمیان بە هیوای کشانەوە لە وێوە بەرەو ئێران. هەر لەو ڕۆژەشەوە خەلکی سیڤیلی گوندەکانی قەراخ دەستیانکرد بە چۆلکردنی گوندەکانیان، بەشی زۆر ڕویانکردە سلێمانی. بەلام سەیتەرەی پێشمەرگەی ینک ڕێگەی لەزۆر کەس گرت و گەڕاندنیەوە بۆ قەراخ، ( پێیان وتن ) : " قووبوڵی ناکەین ناوچەکە چۆڵ بکەن ". هێندێ لەوانەی گەڕێنرانەوە بە ناچاری ڕویانکردە گەرمیان بە هیوای خۆ ڕزگار کردن لەو ڕێگەوە بەڵام لە گەرمیان کەوتنە دەست حکومەت و چوونە ڕیزی شەهیدانی ئەنفال. گەلێک لە سەرۆک جاشەکان، لە پێش هەمووشیانەوە سەرەکجاشی بێ ئابڕو فتاح بەگی جاف، ڕۆڵێکی زۆریان هەبوو لە گرتن ورادەستکردنی ئەو هاوڵاتیانەی ئەنفال کران. پێویست بوو ئەو سەرەکجاشانە، لەدوای ڕوخانی سەدام، بگیرایەن و بدرایەن بە دادگا لەسەر ئەو هەموو تاوانکاریە، بەڵام بە پێچەوانەوە، هێندێ لە بەرپرسان یارمەتی گەورەترین تاوانبارانیاندا بۆ شاردنەوە لەگەل و ڕۆیشتن بۆ دەرەوەی وڵات.

دێمەوە سەر کیمیابارانی پێشمەرگەو خەڵکی سیڤیلی کوردستان. من وەکو شایەتحاڵ باسی کیمیا بارانی هەرسێ گوندی تەکێ و بەلەکجارِ و بەڵخە دەکەم لە ڕۆژی ۲۷ / ۲ / ۹۸۸. بە پیاسە لە گوند چوو بوومە دەرەوە، بەسەر بەرزاییەکەوە لە نێوان شاخ و گونددا، کە گوێم لە گرمەی فڕۆکەی سیخۆی بوو. تەماشای ئاسمانم کرد ٦ فڕۆکەم ژمارد. کەهاتن یەکەم شت قونبەلەیە کیان فڕێدا بۆ بەلەکجارِ، غازێکی چڕی مەیلەو زەرد بەرزبووەوە بەرەو باکوری ڕۆژئاوا بە سستی دەجولا. دیار بوو بۆ ئەوە بوو کە بزانن هەوا لە کوێوە دیت و بۆ کوێ دەچێ. لە سوڕی دووەمدا فڕۆکەکان بەرەو هەریەک لە گوندەکانی تەکێ و بەلەکجار چوار قونبەلەی ٥۰۰ (پێنج سەد) کگمی تێهاوێژرا. نەمزانی چەند دانە بۆ بەڵخە هاوێژرا. گوندەکان لەترسی کیمیا باران چۆڵکرابوون، ئەوی مابوو لە گووندا چووبوونە ئەشکەوت و کونە بەرد لەدەرەوەی گوند. ڕۆژی (۲۷ / ۲)، ۳ خێزان و مەفرەزەکەی من مابوون. خێزانێکیان سەدیقی پیرەمیرد و ئاسکەی هاوسەری، لەکاتی بۆمبارانەدا سەدیق دور لەدێ کاری کشتوکاڵی دەکرد و ئاسکەش لە ئەشکەوتێکی نزیک لە گوند دانیشتبوو تەشی دەرِسا. خێزانی هەردو جوتیار علی حسن و حسین محمد لە تەنیشت قوتابخانەی گوندەوە، نزیکی ٥۰م لە جێگەی کەوتنی قونبەلەیەکەوە دەژیان، بەڵام خانوەکانیان ۱٥ ـ ۲۰ م بەرزتربوون. علی بەفەوری بەسواری کەرێ برا بۆخەستەخانەی پێشمەرگە شیوعیەکان لەبەردەمی دەربەندی نارامسین.

من لەسەر بەرزایەکەوە گەڕامەوە، بڕیارم دابوو پاش چارەکە سەعاتێ بچمە ناودێ بۆ ئەوەی غازی کیمیاوی نەمێنێ. کە چووم بۆنێکی بەهێز، تێکەڵ لە بۆنی سیر و سێو لووتی پڕکردم. بانگی پێشمەرگەکانم کرد و گەڕانەوە بۆناو دێ. جەولەیەکم دەسپێکرد بەناو

گوندا. یەکەم قوربانی بومبارانی کیمیاویم لەنزیک ماڵی سەدیق بینی: مانگایەک و دوو پارین لە کۆڵانێکدا کەوتبوون لە گیانەڵادا بوون و نەیشمان توانی هیچیان بۆ بکەین. لە کۆڵانەکانی ناو گوندا چەندین دانەی دیکە لە ئاژەڵ و مریشکی مردارەوە بومان بینی. گەیشتمە ماڵی حسین. خۆی هێشتا نە هاتبووەوە، منالەکانی بەدیار فاتەخانی دایکیانەوە بوون و حاڵی شڕبوو. نازانم بۆچی لەم خێزانە تەنها دایکیان و لە خیزانەکەی علیش لە تەنیشتیانەوە تەنها باوک حاڵی خراپ بوو، منالەکانیان لەوەزعێکی زۆر باشتردابوون. ئێمە هەشت دەرزیمان هەبوو بۆ ئەم حاڵەتانە . دەرزیەکم دا لە فاتەخان و بە منالەکانیم وت :

. مەترسن، دایکتان تا سبەینێ چاک دەبێ.

هێندێ لەخەڵکی گوند کە زانیان بە بۆمبارانەکە گەڕانەوە لە ئەشکەوت و کونە بەردەکانەوە بۆ گوند. هەیانبوو یەکسەر دەهاتنە ناوگوند و هەشیانبوو نەیان دەوێرا، هەر لەدورەوە دەوەستان و بانگیان دەکرد، هەواڵیان دەپرسی کە نەترسن لە هاتنە ناودێ؟ سەدیق پاش سەعاتێ لە بۆمباران لەسەر زەرعاتەکەیەوە هاتەوە بۆناو دێ. ڕێگەی بەلای قوتابخانەکەدا دەرووێشت. دوسێ کەس لەولاوە وەستابوون، بانگیان کرد :

. کا سەدیق وریابە، زۆر نزیکی ئەوچاڵە مەڕۆ.

. چاڵی چی؟

. چاڵی قونبولەی کیمیاوی.

کە چاڵەکەی بینی چووە پێشەوە، لەکەرەکەی دابەزی و تۆزێ لە گوێ چاڵەکە وەستاو تەماشای کرد. چووە ناوی، جنێوێکی هەواڵەی سەدام کرد و لەقەیەکی کێشا بەو شتە خۆڵەمێشیەدا. وتی :

. ئا ئەمەیە کیمیاوی کە سەدام ئەم عالەمەی پێترساندووە؟

لەقەیەکی تری لەدەرمانی ناو چاڵەکە دا لەگەڵی جنێوێکیتر بۆ صدام و هاتە دەرەوە، سواری کەرەکەی بوو بەرەو ماڵی خۆی. ئێوارە دنیا تاریک بووبوو کە یەکێ هات بۆ بارەگاو وتی :

ـ کا سەدیق زۆر خراپە. فریای نەکەون ئەمشەو ئەمرێت.

چووم بۆ ماڵی حاجی صدیق. لەسەر جێگە کەوتبوو دەینکان. تەنها پیرە ژنی هاوسەری بەدیاریەوە بوو. وتم :

حاجی مەترسە، دەرزیەکت لێدەدەم و هەتا بەیانی باش دەبیت. بەس دەپرسم : بۆچی چویتە ناو ئەو چاڵەو لەقەت لێیدا؟ ئەتدەزانی ئەوە خەتەرە؟

ـ خۆ بەخوا هاواریشیان کرد، وتیان : حاجی نەکەیت، خەتەرە ! بڵێم چی شەیتان ئەو هەڵەیەی پێکردم .

کەس لەگوندی تەکێ نەمرد. پێشمەرگەکانیشم تووشبوون، چاویان سووربوو، ناوی پێدا دەهاتە خوارێ، خۆیشم هەروەها. لە ڕاستیدا نەمدەزانی ئەنجامی بەچی دەگات، بەلام دەمویست ورمیان بەرز ڕاگرم. لە بەلەکجاڕیش کەسی خەڵکی گوند تووش نەبوو چونکە گوند بەتەواویی چۆڵ بوو. پێشمەرگەی ینکیش ئیحتیاتی خۆیان وەرگرتبوو. دواتر وترا پێشمەرگەیەکی عەرەب لە پێشمەرگەکانی ئەنجومەنی باڵای ئیسلامی بەرکەوت و شەهید بوو. گوندی بەڵخەش چۆڵبوو.

دەپرسرێ : چۆن هەردو خێزانی علی و حسین کە قەڵەباڵغبوون بە مناڵ بەسەلامەتی دەرچوون، هەرنزیکەی ٤٠ ـ ٥٠ مەتریش دور بوون لە تەقینەوەی قونبولەیەکی کیمیاوی وەها گەورەوە؟ پێموایە هۆکاری سەلامەتیان دەگەرێتەوە بۆ تۆپۆگرافییای زەمینەی گوندەکە و قورسی غازی خەردەل و ئەعساب. خانوی هەردوکیان ئەختێ لە جێگەی کەوتنی قونبەلەکە بەرزتر بوو.

ئەوە بۆمبارانی سەرەکی تەکیە و بەلەکجاڕ بوو. وردە بۆمبارانیش بوو بوو بە کارێکی نیمچە ڕۆژانە گولەی کیمیاوی تۆپی دوور بورد لەسەر بازگەی دەربەندیجانەوە ئەهات و لە پشتی گوندەوە دەتەقیەوە، غازەکەی بەناو گوندا دەهاتە خوارێ. بەڵام زیندەوەر لە گوندا نەبوو جگە لە چۆلەکە پاساری.

گوندی سیوسێنان ( کە ئیستە ناوەندی ناحیەیە ) لە مەسافەی ٣ . ٤ کم لە ڕۆژهەڵاتی تەکیەوە یە. لەو ڕۆژانەدا قەڵەباڵغترین گوند بوو لە قەرەداغدا. خەڵکی ئەوگوندانەی دەورو بەر دەیانوت :

ـ ئەوە سێوسێنان بۆمباران ناکرێ، نەبە فرۆکە و نەبە تۆپ، چونکە پڕە لە سیخوڕی سەدام.

ـ بەڵێ تا ئیستە بۆمباران نەکراوە، بەڵام کەس نازانێ لەم ڕۆژانەی داهاتوودا دەکرێ یان ناکرێ.

دنیا تاریک بوو، سەعات دەی ئێوارەی ٢٢ / ٣ / ١٩٨٨ لە تەکێ پاسەوانەکەمان هاتە ژوورەوەو ڕای گەیاند :

. گولە تۆپ زۆر لە دەربەندیخانەوە نرا بە سێوسینانەوە، بەڵام پێموایە بۆمبارانی کیمیاوی بوو، چونکە گولەکان کە دەتەقینەوە تڵپەیان دەهات وەکو ئەو قونبولانەی پێشتر دران بە تەکێ و بەلەکجاردا.

پاسەوانەکە ڕاستی کرد، ئەوە بۆمبارانی کیمیاوی گوندی سێوسێنان بوو. قونبولەکانیش نزیکەی ( ٤٠ ) ڕەکێت بوون لەدەربەندیخانەوە بە قازیفە تەقێندران بۆ گوندێکی بچووک . سێوسێنان. هەموو ڕەکێتەکان لەناو گوندا تەقینەوە. گوندەکەش بۆ نەگبەتی لە زەمینێکی بچووکی نەختێ تەختدایە، کە لە ٧٠ ـ ٨٠ خێزان زیاتری تێدا نەمابوو لەو کاتەدا. قوربانیانی بۆمبارانەکە نزیکەی ٧٠ شەهید و هەموو دانیشتوانیش بە پلەی جیا جیا برینداربوون. هێندێ خێزان قەلاچۆکران. خێزانی مەهدی زۆراب کە لە ١٤ سەر پێکهاتبوون ١٣ کەسیان لەوێدا

شەهید بوون و محمەدی کوڕی مەهدی مایەوە لە ژیاندا چونکە پێشمەرگە بوو، لەناو پێشمەرگەکاندا بوو. عوبەیدی جلدروو لەگەڵ ژنێک و چوار منداڵیدا دەژیا، تەنها خۆی مایەوە. ڕژێمی فاشی ئەوانەی بەدرۆ خستەوە کە دەیان ووت : ( سێوسێنان سیخوڕی سەدامی زۆر تێدایە بۆیە کیمیاباران ناکرێ ). ئەوەتا کیمیا باران کرا بەشێوەیەکی خراپترو دڕندانە تر لەهەمو گوندەکانی تری کوردستان، کە بوو بە هەڵەبجەیەکی بچکۆلە. بە بەراوردیش ۷ ڕۆژ دوای کیمیابارانی هەڵەبجە بوو.

هەرئەوشەوەو ڕۆژی دواتر ژمارەیەکی زۆر لە گوندنشینانی دەوروبەری سێوسێنان چوون بەدەم شەهیدەکانەوە بۆ بە خاکسپاردنیان. دوای ڕاپەڕینی ۹۹۱ هەمو شەهیدانی کیمیابارانەکە گوێزرانەوە لە گۆڕستانیکی تایبەتدا لە تەنیشت گوندی سێوسێنان بەخاک سپێردران.

# شەڕی کەنداو و ڕزگاربوونی هەرێم لەسەدام

پاش ٣٠ ساڵ لەخەباتی چەکداری دژی رژێمی عێراق بزووتنەوەی ڕزگاری خوازی کورد گەیشتە ئەنفال و کیمیاباران. هیچ ئاسۆی هەڵسانێکی لەبەردەمدا نەبوو بۆ دوارۆژێکی دیاری کراو ئەگەر بێعەقڵی دکتاتۆری بەغدا بەداگیرکردنی کوێت و یاخی بوون لە ئاغای پێشووی ـ واشنتۆن ـ ئەو هەلەی نە ڕەخسانایەت. هێزی ئۆپۆزسوێنی عێراق، بە عەرەبی و کوردیەوە، زۆر لاواز بوو بوو، خەباتی چەکداری تووشی تێشکان بووبوو. لەدۆخێکی وەهادا شەڕی کەنداوی یەکەم دەستی پێکرد. جگە لەسەدام هەمووکەس دەیزانی کە ئەنجامی شەرەکە چۆن دەبێ. سوپای سەدام لەبەر هێرشی فرۆکەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانان تیشکا بەبێ هیچ شەڕو پێکدادانێکی زەمینی، کەوتە کشانەوەیەکی ناڕێکخراو و بێ سەروبەر. کوێت ڕزگار کرا لەداگیرکەران, بەڵام ڕژێمی سەدام نە ڕوخێنرا, عێراق ڕزگار نەکرا. ئەمە بۆ چی؟ پریما کوف، وەزیری دەرەوەی یەکێتی سۆڤیت لەوکاتەدا وەلامی ئەم پرسیارەی داوەتەوە :

ـ لەورۆژەدا کە سوپای ئەمریکی هاتبوە ناوخاکی عێراق سەدام لە بەغدا پێوەندی کرد بە باڵوێزی سۆڤیەتەوە لە بە غداو پێیراگەیاند کە بڕیاری داوە دەسەڵات ڕادەستی شیعەکان بکات و عێراق بەجێبهێڵێ، ئەمەش مانای وایە عێراق دەکەوێتە ژێردەستی ئێران.

گەربەچوف سەرۆکی ئەوکاتەی یەکێتی سۆڤێت ئەم هەواڵەی بێدواکەوتن گەیاندە سەرۆکی ئەمریکا جورج بوش. لێرەدا پرسیارێکی چاوەڕواننەکراو هاتە بەردەمی بۆش:

کام لەم دوشتە هەڵبژێرێت؟ عێراق بکەوێتە ژێردەستی ئێران یان لە دەستی سەدامێکی تێشکاوو لاوازدا بمێنێ؟ بۆش دەبێ ئەمە تاوتوێ

بکات : ئێران دەستبگرێ بەسەر عێراقدا یان سەدام بمێنێتەوە؟ کامیان لە بەرژەوەندی ئەمریکایە؟ مانەوەی سەدامی پێباشتربوو. فەرمانی دەرکرد بە وەستاندنی شەڕ. سەرکردەی هێزی سەربازی ژێنرال شوارسکۆ داوای لە بۆش کرد :

-مۆڵەتمبدە لەماوەی چوار سەعاتدا بەغدا دەگرم و شەڕ کۆتایی دێت.

-نەخێر مۆڵەت نیە، ئەوە پرسێکی سیاسیە و دەبێ شەڕ بوەستێ.

ئەمریکا شەڕی وەستان و مانەوەی سەدامی لە کورسی دەسەڵات قبوولکرد. لەوەش زێتر، گڕی سەوزی بۆسەدام هەڵکرد کە بۆی هەیە پاشماوەی هێزی سەربازی خۆی لەگەڵ فڕۆکەکانی کۆبکاتەوە و بەکاری بێنێ دژ بە جموجوڵی شیعەکانی عێراق.

جەماوەری شیعە لەشارەکانی باشوری عێراق یەکەم کەس بوون کە دژی سەدام ڕاپەڕین و دەستیان گرت بەسەر گەلێ شارو جێگەدا. بەڵام سەدام دڕندانە بەرەنگاریان بووەوەو توانی سەرکوتیان بکات. ئەوەش ڕۆڵی هەبوو کە شیعەکان ئەزموونی ڕێخستن و خەباتی چەکداریان نەبوو، بە پێچەوانەی کوردەکان کە ئەزموونی دەیەها ساڵی بزووتنەوەی چەکداری و ڕێخستنی چەکداریان هەبوو.

# راپەڕینی جەماوەری ۱۹۹۱

جەنگی کەنداوو تێشکانی سەدام زەمینەیان خۆشکرد بۆ ڕاپەڕین. سەدام ئەو توانایەی پێش جەنگەکەی نەمابوو، بەتایبەتی دەرهەق بە کورد کەهێشتا هێندێ یەکەی پێشمەرگە مابوو بە ئاسانی دەیتوانی ڕیزەکانیان بەربڵاوکات. گومان لەوەدا نیە کە یەکەم شار شەرەفی دەستپێکردنی ڕاپەڕینی پێبڕا ڕانیە بوو، لە ۵ /۳/ ۱۹۹۱ دا، دووەمیش سلیمانی بوو لە ۳/۷ دا. بەڵام مشتومڕی زۆر لەسەر ئەوەکراوە کە کێ ڕاپەڕینی دەستپێکردو ئایا لەسەر بڕیاری حیزبێ دەستی پێکرد یان بە شێوەیەکی عەفەوی؟ هێندێ کەس دەڵێن : بەبڕیاری ینک دەستی پێکرد. بەڵێ بڕیاری حزبی بووە بۆ بەرپاکردنی ڕاپەڕین، بەڵام حیزبەکان دووربوون لەشارەکانەوە، فریانەکەوتن، تا هاتنەوە جەماوەری لاوانی ناوشار، بەخواست و ئارەزووی خۆیان و بە کاریگەری ڕادیوی یەکێتی، - لانی کەم لە ڕانیە و سلیمانی – دەستیان بە ڕاپەڕین کردبوو. ئەو قسەیەی سید کاکە ڕاستە کە بە نەوشیروانی وتبوو :

( ماڵت خراپ نەبێ ڕاپەڕین دەستی پێکردووەو وا ڕانیە خەڵاسبوو سەروچاوەو چوارقورنەو لە هەموو جێگەکان جەیشی سەدام لە تەسلیم بوونن ! ئیتر شانەی چی و چونە خوارەوەی چی؟ ) نەوشیروان گووتی : چۆن؟ ئەمە کێ کردی؟ ( گووتم بابی من خەڵک و عەسکەری فیرار هەموویان بەیەکەوە هیرشیان بۆسەر مۆڵگەکانی بەعس دەسپێکردووە )

لەسەرەتاوە گەنجەکانی ناوشار، کەیەکپارچە بوون لەڕق و کینە بەرانبەر بەرژێمی سەدام، هێزی سەرەکی سەرشەقام بوون و ڕۆڵیکی گەورەیان هەبوو. بەڵام ئەم حاڵە زۆری نەخایاند چونکە ئەزموونی سیاسیان نەبوو، لەروانگەی بەستەڵکی بیروباوەر دەجووڵان. یەکەم

پرۆژەیــان هەڵبژاردنــی ســۆ ڤیتات بــوو بــۆ گەرەک و شــارو تــوێژە جیاجیا کانی کۆمەڵگە، وەک ئەوەی لە کۆمۆنەی پاریسدا کرا، ئەوەیان نەدەزانــی کە نە سلێمانی پاریــسە و نەدۆخــی کــۆمەڵایەتی ئێــرە وەکــو دۆخــی کــۆمەڵایەتی فەرەنــسایە لە رۆژانــی کۆمــۆنەدا و نەئەزمــوونی کۆمۆنەی پاریس سەرکەوتنی بەدەســتهێنا هەتا ئێستە تەقلیدی بکەیــن.
کە حزبەکــان گەرانەوە بۆنــاو شــار، بەســەرکردایەتی کــادرو پێــشمەرگە بەچەکەکانیــانەوە، بەمێژوویەکــی خەبــاتگێری ونەزمــوونێکی زێتــرەوە لەکاروبــاری سیاســی و رێکخراوەییــدا، وردە وردە تەرازووی هێــز گــۆڕدرا لەبەرژەوەندی ئەو حیزبانە و لەهەموو گرنگتر دەسەڵاتیان گرتە دەست.
شیوعیەکانیش کە هێشتا نەبرینی بەرەی پاشکۆگەری لەگەڵ سەدام و نەبرینــی پاشــکۆگەری بــۆ پــارتی دژی ینــک یــان ســارێژ نەکردبــوو، لەدۆخێکــی وەهــا دانەبــوون، کە بتــوانن کەڵــک لەو گۆرانکاریــانە لە کوردســتاندا وەربگــرن. هەمــوو ئەزمــوونێ کە فێــری بــوون لەکارەســاتی پشتاشان بریتی بوو لەوە کە جارێکی دیکە نەبنە پاشکۆی تاکە حیزبێ لەپــارتی و ینــک، بەڵکــو پاشــکۆگەری بــۆ هەردوو حیــزبەکە بــکەن لەیەک کاتدا.
کــارتی بەهێــز بەدەســتی حزبەکــانەوە لە کــاتی گەرانەوەیــان بــۆ شــارەکان ئەوەبــوو، کە وەکــو بەرەی نیــشتمانی کوردســتان بەیەکرێــزی گەڕانەوە. لەلایەکیتریشەوە تێشکانی سەدام لەجەنگی کەنداودا پرسێکی گرنگ بوو بۆ ئەم حیزبانە و هەموو ئۆپۆزیسیۆنی عێراق.
جگەلەمەش پارتی و یەکێتی هەر حیزبە یەک سەنتەری بریاری هەبوو، بەپــێچەوانەی گەنجەکــانی ناوشــار کەفــرە ســەنتەر بــوون. لەبەر ئەوە دیاردەیەکی سروشتی بوو کە حیزبەکان دەست بەسەر وەزعدا بگرن،بەڵام ئەوە سروشــتی وچــاوەڕوانکراو نەبــوو، کە رەوتــی ئەو گەنجەچەپخــوزانە نەتوانن تەنانەت تاکە کورسیەکی پەرلمانیش بێنن.

لەســـەرەتای گەڕانەوەیـــانەوە حیزبەکـــان بەنـــاوبوون بە حـــوکمڕانی کوردستان،بەڵام بەکردار زێتر سەرگەرمی تاڵانی وشت فرۆشتن و پارە پەیـدا کـردن، چ بـۆ حیـزب و چ بـۆ فـلان بەرپـرس. بۆمـاوەیەک مونافەسـەیەکی تونـد بـوو لەناویانـا، بەتـایبەتی لەنێـوان هەردووحیزبـی سـەرەکی، بـازاڕی سـەرەکی بـۆ زۆرشـت ئێـران و تورکیـا بـوو، ئەوەی دەفرۆشرا سامانی گەل و نیشتمان بوو، دزی بوو، گەندەڵکارییەکی زەق بـوو، ئەو دزی و شـرەخۆرییە لە قۆنـاغی یەکەمـی حـوکمڕانی حیـزبە نەتەوەیەکـانی کوردسـتانی عیراقـدا بەڵـگە بـوو، کە ئامانجیـان، پـێش هەمـوو شـت، بەدەسـتهێنانی کورسـی و پـوول وپـارەبوو. لەسـەرەتای حوکمڕانیـانەوە گەنـدەڵکاری لەشـێوازی تـاڵانی و فرۆشـتنی شـوفڵ و گەڵابە و مەکائین و ئەوئامێرانەی کە زووتر کرِدرابوون بۆ دروستکردنی بەنداوی بێخەمە و فرۆشران لە لایەن ینـک و پارتیەوە. لەساڵانی دوای ئەوتاڵانکاریە گەندەڵکاری بەردەوام بوو بەشێوازی جۆراوجۆر و گەیشتە پلەیەکـی خەیـاڵی، بەتـایبەتی پاش ئەوەی کە بەرهەمهێنـانی نەوت زۆر پێشکەوتوو، کەوتە ژێر دەستی سەرانی پارتی و یەکێتـی. پاش ٢٧ سـاڵ لە حـــوکمڕانی لەلایەک دەیەهـــا ملیـــار دۆلار کەڵەکە کـــراو لەلایەکیتریش بێموچەیی و نەهامەتی و بێکاریی خەڵک.

بۆمـاوەیەکی کـورت بەرەی کوردسـتانی حـوکمڕانی کـرد. لەسـەرەتاوە، ئەگەر چـی فرِکـان فرِکـانی تاڵانکـاری زۆر گەرم بـوو، مـیللەت لە جەژنێکی راستەقینەدا بوو.بەڵام مەترسی هەبوو لە گەرانەیەوەی سـوپا و دەسـەڵاتی سـەدام بـۆ کوردسـتان، هەتـا هاوپەیمـانی بـوجەنگی کەنـداو، بەسـەرکردایەتی ئەمریکـا، فرِینـی لە فـرۆکەی سـوپا قەدەغەکـرد بەئاسـمانی پارێزگاکـانی هەرێمـدا. دوای ئەوە مەترسـی لەگەڕانەوەی سوپای عێراق نەما و جۆرێ لەئارامی جێگیر بوو.

باشترین ئیشی بەرەی کوردستانی ئەوە بوو کە بڕیاریدا هەڵبژاردنیکی پەرلەمانی لە هەرێمدا جێبەجێبکرێ. ئەمە یەکەمجاربوو بەدرێژایی مێژووی کورد کە گەلی کورد بتوانێ لە وڵاتی خۆیدا شتی لەم جۆرە بکات. ئەگەرچی بەیاسایەکی نادیموکراسیانەبوو، بۆ بەرژەوەندی پارتی ویەکێتی دارێژرا بوو. بەگوێرەی ئەو یاسایە هەر حزبێ سەرجەمی دەنگەکانی (٧٪) کەمتر بووبێ بۆی نیە بچێتە پەرلەمان. لەبەر ئەوە هیچ کەسیتر نەچووە پەرلەمان جگەلە نوێنەرانی پارتی و یەکێتی کە ئەندامێتی پەرلەمانی هەرێمیان بەشکرد بەرێژەی پەنجا بەپەنجا. ئەمە مانای ئەوە بووکەهەرلەسەرەتاوە پارتی ویەکێتی پەرلەمانیان بۆ حیزبە نەک بۆ گەل و نیشتمان.

# مەترسیترین جەولەی شەڕی براکوژی - نەوەدەکان

جەنگی کەنداو هەلێکی هێندە لەباری بۆ بزوتنەوەی رزگاری خوای گەلی کورد رەخساندکەقەت بەخەیاڵی کەسانەهاتووە:

١- پاش ئەو تێکشاندنە گەورەیەی ١٩٨٨ ی کورد، کە هاوکات بوو لەگەڵ وەستانی شەڕی عێراق –ئێران هەلێکی نوێ هاتە پێشەوە کە کورد بتوانێ بە فەوری هەڵسێتەوە سەر پێی و دوژمنی – سەدام – هیچی پێنەکرێ

٢- لەگەڵ هەڵسانەکەیشیدا کورد، بۆ یەکەمجار بەدرێژی مێژوویی، لەژێر دەستی کەسیتردا نەبێ، بەڵکو خۆی ببێ بە حوکمڕانی خۆی بۆ ماوەی ١٢ ساڵ.

ئەگەر جڵەوی حوکمڕانی لەو ١٢ ساڵەدا لە دەستێکی دڵسۆزی زاناو خاوێندا بوایە، کە هەموو توانای بخستایەتە گەڕ بۆ بنیاتنانی هەرێم لە رووی سیاسی و ئابووری و رۆشنبیرییەوە دەتوانرا ئەم هەرێمە بکرێ بە وڵاتێکی پێشکەوتوو لەسایەی رژێمێکی دیموکراتیدا کە ببوایە بەفاکتەرێکی بەهێز و سەرنجراکێش لە هەموو ناوچەکەدا، دەیتوانی یارمەتی گەورەی هاوپەیمانان بدات لەبەرژەوەندی خودی هەرێم و هەموو عێراقیشدا، بەڵام ئەوی رووپدا لەو ساڵانەدا دوای شەڕی کەنداو تەنها تۆمارکردنی لاپەرەیەکی تازەی پڕ لە نەهامەتی و شەرمەزاری، شەڕی براکوژی و خوێنڕشتن و کاولکاری لەنێوان پارتی و یەکێتیدا. شەڕی براکوژی هەمیشە شتێکی خراپ بووە، هەڵەیەکی کوشندە بووە، بەڵام بەتایبەتی ئەم جارەیان کە کورد رزگاربوو لە سەدام و ١٢ساڵ خۆی حوکمڕانی خۆی بوو، بەڵێ، ئەمجارەیان دۆخێکی زۆر هەستیار و ناسک هاتە ئارا، کە لە هەموو مێژووی هەرێمدا هەلی وەهای بۆنەڕەخساوە، ئەگەر ئەو ١٢ ساڵە بەکاربهێنرایە بە دڵسۆزی ودەسپاکی

ولێزانانه بۆ بنیاتنانی و گەشەپێدانی هەرێم لەکاتی رووخانی رژێمی بەغدا ئەم هەرێمە قورساییەکی تری دەبوو، حسابێکی دیکەی بۆدەکراو کورد رووبەرووی ئەنجامێکی جیاواز دەبۆوە. بەڵام ئەنجامی ئەم هەڵە گەورەیە، ئەم جەولەیەی شەڕی براکوژی کە لەسەر هیچ نەبوو جگەلە هەوڵی قۆرخکردنی دەسەڵات، جگەلەشەڕ لەسەر کورسی و پارە، ئەمانەی خوارببوو:

١- دروستکردنی دوو ئیدارەیی لەم هەرێمەبچوکەدا، ئیدارەی پارتی و ئیدارەی یەکێتی، ئەمە لەکاتێکدا کە گرنگترین فاکتەری سەرکەوتن یەکریزی میللەتی کورد بوو.

٢- پەکخستنی پەرلەمانی کوردستان، لەباتی ئەوەی کێشەکان لەناو ئەو پەرلەمانەدا چارسەر بکرێن، ئەمەش ئەو راستیە نیشاندا کە پەرلەمانی حزب، ووردتر بڵێین پەرلەمانی سەرۆک دروستکراوە نەک پەرلەمانی کۆمەڵگە.

٣- خەرجکردنی ئەو داهاتە کەمەی کە دەهاتە دەستی حکومەتی هەرێم بۆکاولکاری و خوێنرشتنی گەنجەکانی کوردستان لەکاتێکدا کە ئەم وڵاتە وێرانبوو، پێویستی بە ئاوەدانکردنەوە بوو .

بەبۆچوونی من ئەو جەولەیە لەشەڕی براکوژی گەورەترین زیانیدا لە بزووتنەوەی رزگاریخوازی ئەم گەلە چونکە هەلێکی مێژوویی زۆر دەگمەنی لە کیسدا کە پێشتر هەڵنەکەوتوەوجارێکتیرش بەدەست نایەت .

شایانی باسە کە بەرپرسیارانی هەردوو حیزبی حوکڕان لەو شەڕو لە زنجیرەی شەڕەکانی براکوژی لە ١٩٦٤ وە بۆ ١٩٩٧ هیچ باجێکی ئەو هەڵە گەورەیە و زنجیرەشەڕەکانی براکوژیان نەداو تاکو ئەم چرکەیەش هەر خۆیان حوکمڕانن.

برینی شەڕی براکوژی نەوەدەکانی سەدەی بیستەم هەتائێستە سارێژنەبووتەوە، جێماوی دوو ئیدارەیی بەزەقی دەبینرێ کە تا ئێستە

بەردەوامە، بەڵام تۆزێ بەداپۆشراوی، بەشێکی هەرێم ناوچەی دەسەڵاتی ئەم حیزب و بەشەکەی دیکە ناوچەی دەسەڵاتی ئەو حیزبە، کەلەباتی سوپایەکی نیشتمانی وڵات دوو میلیشای هەردوو حیزب هەیە، کە لەباتی یەک دەزگای پۆلیس و ئاسایشی دەوڵەت دوو دەزگا هەیە + دوو دەزگای هەواڵگری بەناوی پاراستن و زانیاری کە حیزب دروستی کردووە و حیزب بەڕێوەیان دەبات و مووچە و مەسرەفیشیان لە بوودجەی رەسمی هەرێم وەردەگیرێ.لەکاروباری ئابووری و بانکیشدا هەردوو ئیدارەیی بەکردەوە ماوە.

ئەو دوو حیزبە کەلەسەرەتادا یەک حیزب بووە لەچوارچێوەی یەک عەقڵیەت و یەک ئایدۆلۆژیی نەتەوەییدا - کوردایەتی - دروستبووە دەرچووی یەک قوتابخانەن، سێیەکە سەدەیەکە لەململانێی خوێناویدا بوون، کە هەوڵی قۆرخکردنی دەسەڵات دەدەن، هەرلایەنە بەتەنها بۆخۆی لەباتی پێکەوە ژیانێکی شارستانیانەی هاوچرخ. لەم ساڵانەی دواییدا کە ململانێی خوێناوییان لەنێوان خۆیانداوەستاندووەو رێکەوتون لەسەر پاراستنی بەرژەوەندی هاوبەش دژ بە ئۆپۆزیسیۆن، بۆنموونە هاوکاری یەکتریان کردووەلەپرسی فایلی نەوت و گەندەڵکاریدا و ململانێشیان بەردەوام بووە لەسەرهێندێ پرسی تر.

# ئایا سەدام حسین سیخوڕی CIA بووە ؟

دوای شۆڕشی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨، کەلەشێوەی کودەتایەکی سەربازیدا سوپای عێراق بەپشتیوانی بەرەی نیشتمانی وجەماوەری گەل جێبەجێیکرد، هەردوو دەوڵەتە ئیمپریالیەکان کەوتنە دژایەتییەکی توندی ڕژێمی نیشتمانی، کە عبدالکەریم قاسم سەرۆکایەتی دەکرد، بەیارمەتی چروپری ئەمریکا وبەریتانیا دووجار لەماوەی ٦ ساڵدا دووکۆدەتای سەربازی لەعێراقدا سازکرا بۆهێنانە سەر کورسی دەسەڵاتی حیزبی بەعیسی فاشستی، بەمەبەستی تۆڵەسەندنەوە لە ڕژێمی نوێی قاسم و حشع و هەموو هێزە دیموکراتی و نیشتمانییەکان، کوۆدەتای ١٩٦٣کە قاسم وکۆمەڵی ئەفسەری دەوروبەری و (٥) هەزار لە حشع و کەسانی دیکەش تێدا کوژران، کودەتای دووەم کەلە ١٩٦٨ حیزبی بەعسی گەراندەوە سەر دەسەڵات بەسەرۆکایەتی سیخوڕی (CIA) سەدام حسێن کە ٣٥ ساڵ لەسەر کورسی دەسەلات مایەوە، ئەم ڕاستییەکە سەدام سیخور بوو قسەی هەڵبەستراوی کەس نەبوو، بەڵکو ڕاگەیەندراوی ئەندامێکی پێشووی (CIA) بوو. بەناوی ( جۆن پیرکین ).

ئایا سەدام حسین سیخوڕی CIA بووە؟

بەڵێ سەدام حسین سیخوڕێکی پاراستنی ئەمریکا بوو دژ بە کۆمۆنیزم، بۆ ماوەی ٤٠ ساڵ وەکو ئامرازێک بەکاریان دەهێنا.

یەکەم پەیوەندی بەستنی لەگەڵ CIA ساڵی ١٩٥٩ بوو کە بەرپرسیارێتی شەش کەسیان گرتە ئەستۆ بۆ تیرۆرکردنی سەرۆک وەزیرانی عێراق عبدالکریم قاسم، چونکە سەرۆک وەزیران ئەوکاتە پەیوەندی بەست لەگەڵ یەکێتی سۆڤێت و بەنیاز بوو چەکی لێ بکڕێت بەمەش ئەمریکای خستە ترسەوە و ئەمریکا عیراقی بە ناوچەیەکی ستراتیجی باش وەسف کرد بۆ شەڕی سارد دژ بە سۆڤێت.

بە گوێرەی گوتەی سیاسەت مەدارێکی ئەمریکی ساڵی ١٩٥٩ CIA سەدام حسینیان لە باڵەخانەیەک جێگیر کردووە لەشەقامی ئەلرەشید ڕێک بەرامبەر نۆفیسی سەرۆک وەزیران بۆ ئەوەی لە جموجۆلی ئاگادار بێت، وە پارەی ئەو باڵە خانەی سەدامی لێ بوو لێپرساوێکی لقی کاروباری بالیۆز خانەی مصر دابووی بەناوی عبدالمقوی.

ڕاهێنەری ئەوکاتەی سەدام دکتۆرێکی ددان بوو بەڕەگەز عیراقی بوو کاری بۆ مصرو CIA دەکرد.

دوای ئەوەی تەواو زانیاریان دەست کەوت لەسەر جموجۆلی قاسم لە ئۆکتۆبەری ١٩٥٩ هەوڵی تیرۆرکردنی قاسمیان دا،

شۆفێری قاسم تیرۆرکرا بەڵام قاسم تەنیا قۆلی بریندار بوو، چونکە یەکێک لە بکوژەکان نەی توانی فیشەک بەباشی ئاراستەیان بکات وە یەکێکی تر کە نارنجۆکی پێ بوو ناوپۆشەکەی لە چاکەتەکەی گیر بوو،

زۆربەی بکوژەکـان لەهێرشـەکە کـوژران، سـەدام فیـشەک بەر ڕانـی کەوت، بریندار بوو ڕای کرد بۆ تکریت لەوێ وە ڕۆشت بۆ سوریا لە سوریا بە یارمەتی چەند هەواڵگرێکی مصری گواسترایەوە بو بیروت.
ئەوکـاتەی سـەدام لە بیـروت بـوو لەلایەن CIA هاوکـاری دەکـرا بە پێدانی پـارەو گرتنـی باڵەخانە هەروەهـا بەردەوام مەشقیـشی پێدەکرا، لە دوای ماوەیەک گواستیانەوە بۆ مصر.
دوای ئەوەی زانیـان سەدام کەسێکی خوێن ڕێژە بڕیـاردرا چیتر وانەی پێ نەڵێن، لە مصر لە باڵەخانەیەک بوو ڕۆژانە سەردانی چاخانەیەکی دەکرد بەناوی ئیندیانە لەوێ کاتی بە دۆمینە کردن و چا خواردنەوە بەسەر دەبرد جار جاریش سەردانی بالیۆزخانەی ئەمریکای دەکرد بەڵام هەموو کاتێکیش لەژێر چاودێری CIA دابوو.
سالی ١٩٦٣ حزبی بەعس قاسمیان تیرۆر کرد ئەمەشیان بەیارمەتی CIA و ڕێپێدانی جۆن کەنەدی سەرۆکی ئەوکاتەی ئەمریکا بوو.
دوای تیـرۆر کردنـی قاسـم سـەدام حـسین گەڕایەوە عێـراق وەکـو ئەندامێکی چالاکی حزبی بەعس، بەڵام عبدلسلام عارف کە بوو بە سەرۆک وەزیرانـی عیـراق دەستی کرد بە دستگیر کردنـی هەندێ لە ئەندامانی حزبی بەعس و سەدامیش بۆ ماوەی ٣ ساڵ سجنکرا بەڵام سالی ١٩٦٧ لەسجن ڕای کرد.
دوای بەهێز بوونی حزبی بەعس سەدام پلەیەکی باڵای هەبوو وە لەژێر فەرمانی ئەودا دەست کرا بە گرتن و کوشتنی ئەو کەسانەی سەر بە کۆمۆنیزم بوون.
لە هەڵگیرسـانی شـەڕی عیـراق و ئێـران دا CIA تیمێکـی تـایبەتی بەهێزی نارد بۆ یارمەتی دانی سەدام کە بە ڕادارو چەکی کیمیـایی و چەندین جۆر چەکی تر یارمەتی جەیشی عیراقیان دەدا.

له مانگی ٨ی ١٩٩٠ سەدام حسین بە بێ فەرمانی ئەمریکا بە ١٠٠هەزار سەربازی عیراقیەوە لەگەڵ ٣٠٠ تانک هێرشی کردە سەر کوێت و داگیری کرد. ئەمەش وای لە ئەمریکا کرد چیتر بە نۆکەری ئەمریکا سەیر نەکرێ و بەڵکو بە درندەترین دوژمنیش لەقەڵەم درا.

دوای ١٣ ساڵ لە حکومکردنی سەربەخۆی سەدام ئەمریکا لە تەخت هێنایە خوارەوەو هەر خۆشی لەناوی برد

ئیتر ئێمە دەبێت تێبگەین لەوەی هەموو ئەوشتانەی دەکرێت لەژێر سەری ئەمریکا دایە لە زۆربەی ئەو وڵاتانەی کە هاوپەیمانی یەکێتی سۆڤێت بوون.



ئەم سیخورە پاش چەندین ساڵ لە حوکمڕانی گومڕابوو، خۆی لێبایی بوو، هێرشی کردە سەر کوێت و داگیری کرد، دژ بەهەست و خواستی واشنتون و زلهێزەکانی رۆژئاوا. لەسەر ئەوە خرایە ریزی دوژمنانی ئەمریکا، پێدەچێ کاریگەری ئەوەش لەپرسەکەدابێ کە سەدام بۆ چەند ساڵ سیخوری (CIA)بوو، بەموچەی ئەوان دەژیا و بەیارمەتی ئەوان گەیشتە سەر کورسی دەسەڵات و دوای وەستانی شەڕی عێراق ـ ئێران بەوچەشنە لێیان هەڵگەڕایەوە و زۆر تورەی کردن، ئەوانیش تۆڵەیان لێکردەوە. بە کودەتای سەربازی توانای لابردنیان نەبوو، بۆیە بە دەستێوەردانێکی سەربازی ئاشکرا روخانیان .

لێرەدا پرسیار ئەوەیە، ئایا ئەم روخاندنە باش بوو بۆ گەلی عێراق؟ دەگونجا لەگەڵ بەرژەوەندی نیشتمانی ئەم وڵاتە، یان بەپێچەوانەوە؟

ئەم پرسیارە بەدوو جۆر وەڵام دراوەتەوە، یەکەم وەڵام لەعەرەبە نەتەوە پەرستەکانی عێراق و دەرەوەی عێراقە کە دەستێوەردانی کۆمەڵگەی

نێودەڵەتی، بەسەرکردایەتی ئەمریکا، بۆ رووخاندنی رژێمی دیکتاتۆری سەدام، بەداگیرکاری ئیمپریالی ناودەبەن و هەڵوێستیان لە دژی وەرگرت.
وەڵامی دووەم لە کوردو هیندی لەعەرەبی شیعەو سونەو کەمینەکان وەکو رزگارکاری تەماشای ئەو پرۆسەیەی روخاندنی سەدامیان دەکرد.
جا کام لەم دوو وەڵامە راستەا؟. هیچ گومانێ لە وەدا نیە کە لە یەکەم رۆژی دوای ١٤ ی تەمموزی ١٩٥٨ وە رژێمی قاسم چووە ریزی دوژمنانی بەریتانیا و ئەمریکا. ئەوە سروشتی بوو کە دوژمنی قاسم لەهەر کوێیەک هەبن ببنە دۆست و هاوکاری ئەمریکا. لەو روانگەیەوە حزبی بەعس و واشنتۆن یەکیان گرت، بۆ رووخاندنی قاسم، لە ١٩٦٣ و لە ١٩٦٨ دا ئەو هاوکارییە بەردەوام بوو تا دوارۆژی کۆتایی جەنگی عێراق- ئیران. بەڵام ئەو هاوسەنگیە (معادلە) تێکچوو، بە داگیرکردنی کوێت لەلایەن سەدامەوە. ئەو داگیرکردنە واشنتۆن و بەغدای خستە دوو سەنگەری دژ بەیەکتر. واتە زۆرینەی عێراقییەکان دژ بە رژێمی سەدام توانای رووخانیان نەبوو، کەوتنە یەک سەنگەر لەگەڵ ئەمریکا. بام بۆ دونامانجی جیاوازیش بێ، ئەمە مانای وایە بەرژەوەندییەکی هاوبەش هاتە کایە، بام بەکاتیش بێ، واشنتۆن و گەلی عێراقی کۆکردەوە، قەناعەتم وایە کە ئۆپۆزیسیۆنی عێراق سەرکوت کرابوو، لاوازبوو بوو، هیچ شانسێکی لەبەردەم نەبوو، بۆ رووخاندنی رژێم، پاش حوکمڕانی سدام بۆ ماوەی ٣٥ ساڵ. ئەوە رێکەوتێکی باش بوو بۆ گەلانی عێراق بەهەموو پێکهاتەکانیەوە، کە واشنتۆن هەڵوێستی خۆی گۆڕی بەرانبەر بە رژێمی بەعسی فاشی.
سوپای ئەمریکا توانی لەماوەیەکی کورتدا وبەئاسانی سەدام بڕوخێنێ و دەست بەسەر عێراقدا بگرێ، چونکە ئەمریکا بالادەستی (تفوق) سەربازی هەبوو، بەڵام لەبەرێوەبردنی عێراقدا سەرکەوتوو نەبوون چونکە ئەمەیان پێویستی بە ئەزموونی سیاسی و تێگەیشتن لەبارودۆخی عێراق

بوو. ئەوانیش نە ئەو ئەزموونەیان هەبوو نەهەوڵی ئەو تێگەیشتنەیان دەدا. پێدەچێ پشتیان بەچەند عێراقییەک بەستبێ کە لەمناڵیەوە لە ئەوروپا گەورەبوون، وکو ئەحمەد الچلبی یان دەمێساڵە عێراقیان بەجێهێشتووە ودابڕاوون لە گۆڕانکارییەکانی ئەم ولاتە، وەکو د.، ئەیاد علاوی، ئەوەش هەڵسەنگاندنێکی ئەوتۆ نەبوو کە پشتی پێببەسترێت، ئەوناکۆکی و کێبڕکێەش لەنێوان ئەحمەد چلبی و ئەیاد علاویدا هەبوو لەسەر شتی شەخسی و پرسی سەرۆکایەتی سەری لەهەردووکیان و لە ئەمریکییەکانیش شێواندبوو.

کۆنگرەی سەلاح الدین ( کۆنگرەی ئۆپۆزیسیۆنی عێراق) بەڵگەنامەیەکی باشی دارشت سەبارەت بە شێوازی حوکمڕانی دیموکراتی پاش ڕووخانی ڕژێمی سەدام. حکومەتێکی سێبەریش بەسەرۆکایەتی د. احمد الچلبی دروستکرا، بەڵام بەرلەوەی سەدام بڕووخێنرێ ئەم حکومەتە لەدەریای خیلافاتدا نوقم بوو، خیلافات لە کۆنگرەی نیۆیۆرک(١٩٩٩)، پاشتر لە کۆنگرەی لەندەن(٢٠٠٠) توندتر بوو، بەتایبەتی لەنێوان ئەحمەد چلبی و ئەیاد علاوی. من بەئاگانیم بەشێوەیەکی کۆنگریتی خیلافاتیان لەسەرچی و لەبەر چی بوو، بەڵام بێگومان ئەگەر لەسەر شتی سیاسی بوایە دەخرایە موناقشە لە کۆبوونەوەکاندا.ئەم خیلافاتانەی نێوان کەسانی سەربەئەمریکا و جۆرێ لە راوێژکارانی واشینتون بوون رەنگدانەوەی هەبوو لەکارو کرداری ئەو بەرپرسانەی ئەمریکا کە ئیشی عێراقیان هەڵدەسوڕاند.



لەسالانی پێش ڕووخانی سەدامدا شتێکی سروشتی بوو کە ئەمریکیەکان پێوەندیان لەگەڵ سەرکردایەتی پارتی و یەکێتیدا هەبێ و باسی وەزعی عێراقیان لەگەڵ بکەن. بەڵام وەک سەرانی پارتی و

یەکێتی لەروانگەی حزبایەتی تەسکەوە کوردستانیان بەڕێوەدەبرد هەرلەو روانگەیەشەوە باسی وەزعی عێراقیان لەگەڵ کردوون .

بەهەر حاڵ بێ ئەمریکا رژێمی سەدامی رووخاند و راستەوخۆ بەڕێوەبردنی عێراقی گرتە دەست، ئەمە گەورەترین هەڵەی ئەو کاتە بوو، دەبوو بەشێوەیەکی دیکە ئەم ولاتەی بەڕێوەببردایە : کۆمیتەیەک یان ئەنجوومەنێکی کاتی بەڕێوەبەر بۆ عێراق لەکەسانی ناحیزبی لیبراڵ دیموکرات بەسەرپەرشتی بەرپرسێکی وەک پرێمەر، بۆماوەی ساڵیک یان دوو ساڵ، لەوماوەیەدا مامەڵەو هەڵسوکەوت بەشێوەیەکی دیموکراسیانە لە حوکمرانیدا بکرایە. ئەمە رێگەی خۆش دەکرد بۆ دامەزراندنی رژێمێکی دیموکراتی. ئەمەش دەبووە گوشارێ لەسەر هەرێم کە شێوازی حوکمڕانی بنەماڵەیی بگۆڕدرێ بەشێوازێکی دیموکراتی شارستانی، ئەمریکییەکان گومڕابوون و پێیان وابوو بەچ شێوازێ لەئەمریکا ئیش دەکرێ هەربەوشێوازەش دەبێ لە عێراقدا بکرێ. ئەوەیان نەدەزانی کە عێراق لە قۆناغێکی جیاوازدایەو ئەو شێوەکارەی بۆ ئەمریکا دەگونجێ بۆ ئەم ولاتە ناگونجێ.

لەماوەی بەڕێوەبردنی راستەوخۆی عێراقدا ئەمریکیەکان چەند هەڵەیەکی گەورەیان کرد، کە زیانی گەورەیان گەیاند بە گەلانی عێراقیش وخودی ئەمرکییەکانیش، لێرەدا ئامارە بە سێ لەو هەڵانە دەکەم:

١- گەورەترین هەڵەیان ئەوەبوو کە کەلەسەرەوە باسم کرد، کە بەڕێوەبەرێتی خۆی، هەرلەسەرەتاوە، موتوربەنەکرد بە کۆمەڵێ لە کەسایەتی لیبراڵ دیموکراتی عێراقیەوە بۆ ئەوەی کەرەستەی پێویست بۆ دامەزراندنی رژێمێکی دیموکراتی لەعێراقدا ئامادە بکەن بۆدوای قۆناغی بەڕێوەبەرێتی راستەوخۆ. ئەگەر ئەوەیان بکردایە رێگەیاندەگرت لەگەشەکردن، لەو خۆسەپاندنی حیزب و هێزە نەتەوەیی و

تایەفەچییەکانی شیعەو سوننە و کوردو کەمایەتیە توندرەوە ئەنتی دموکراتەکان.

٢- دوای رووخانی سەدام، بەبەرچاوی بەرێوەبەران وسەربازانی ئەمریکاوە ئەو خەڵکە بەنرخی ملیارەها دۆلار سامان و موڵک و ماڵی دەوڵەتی عێراقیان تالانکرد بێ ئەوەی رێگەیان لێبگرن. دەیانتوانی بەئاسانی رێگە لەو تالانکارییە بگرن، تالانچییەکان دەستگیر بکەن، بەیانات بەرادیوو تەلەفزۆین بڵاو کەنەوە... هتد... بەڵام هیچیان نەکرد جگە لەناردنی مەفرەزەیەکی سەربازی بۆ پاراستنی وەزارەتی نەوتی عێراق کەمێشیش نەیتدە توانی بچێتە ناوی. بێگومان وەک وەزارەتی نەوتیان پاراست، ئەگەر بیانویستایە، دەیان توانی وەزارەت و دەوائیر و جێگەکانی دیکەش بپارێزن، ئەگەر تالانیش بکرایە بەشێوەیەکی کەم دەکرا. ئەم هەڵوێستەی ئەمریکا ئەگەر مانایەکی ببێ تەنها ئەوەبوو کە بەرێوەبەرایەتی ئەمریکا رێگرنەبوو لەتالانکاری و پەروەردەی لاوانی عێراق بەگیانی گەندەڵکاری.

باشە ئەوەش بزانرێ کە ئەم تالانکاریە لەو رۆژانەدا لە هەرێم نەبوو چونکە حکومەت هەبوو، ئەو دزی و تالانیەش لەوێش لە راپەرینی ١٩٩١ و رووخانی رژێمی بەغدا روویدا بوو، ئەمە بەشێ بوولە سیستەمی پەروەردەی حیزبی بەعس و هێندی حیزبی دیکە ش لە عێراقدا بەهەرێمیشەوە.

# کۆڕەوی نیسانی ۱۹۹۱

سیاسەت وکار و کرداری ساڵانی سەدام پێش ئەو کۆڕەوەکەشێکی دەروونی وەهای لەناو هاوڵاتیانی هەرێمدا دروستکرد کەئەوخەڵکەی لە رادەبەدەر ترساندبوو، کەم تا زۆر باوەڕیان بەوحوکمڕانە نەمابوو، وەک دڕندەیەکی بێ هاوتا چاوەڕێی هەموو جۆرە تاوانێکیان لێدەکرد. کەناوی سەدام دەهێنرا هەموو کیمیابارانی هەڵەبجە و سێوسێنانیان بیردەکەوتەوە، ئەنفالی ۱۹۸۸یان وەبیردەهاتەوە، رووخاندن و تەختکردنی چوار هەزار گوندەکەی هەرێمیان وەبیردەهاتەوە.... هتد. سوپای سەدام لەهەرێم دەرکرابوو، حیزبەکان و پێشمەرگەو گەنجانی ناو شارەکان دەسەڵاتیان گرتبووە دەست، خەڵک لە جەژنی رزگاربوونیان لە رژێمی فاشستی رەگەزپەرستدا دەژیان. لەپڕ ئەم جەژن و شاییەخۆشەیان لێوەرگەڕا بە شیوەن و هاوار: سوپای سەدام هێرشی هێنا، گەیشتە قەراخشار، کۆمەڵێ لە گەنجانی ناوشارو لەپێشمەرگەی بەغیرەت بەرەنگاری هێرشەکەبوون و بەچەکی سووک و کەمفیشەکەوە، بەشێوەیەکی نابەرابەر.

دەوەرە ئەو خەڵکە لێقەوماوە ترسێندرا وە بێدەسەڵاتەی هەرێم چۆن رووبەرووی ئەم وەزعە ببنەوە، چارەیان چییە؟ کەس نیە بچنە پەنای، کەس نیە لەناو وڵاتی خۆیاندا هاواری بۆ بەرن! ئیتر چیبکەن؟ ئەو دڕندەیە دێتەوە بەو هەموو رق و کینەوە کە تێشکانی ئەم رۆژانەی دوایی، تیشکان لە جەنگی کەنداودا و ناچارکردنی بەجێهێشتنی شارەکانی هەرێم، دەبێ چۆن بێ لەگەڵ ئەم خەڵکە بەسەزمانە.؟ هیچ چارەیەک نیە بۆ ئەو خەڵکە جگەلە هەڵاتن، بەشکو بەسەلامەتی بگەنە ناوخاکی ئێران، یان تورکیا. ئەوکات خەڵکی گوند نەمابوو، سەدام هەموو گوندەکانی کوردستانی تەختکردبوو، گوندنیشنانی

هەرێمـی لە کـۆمەڵگە زۆرەملێکانـدا کۆکردبـۆوە. ئەو خەڵـکە کە بەدوومليـۆن کەس دەژمێـردران لەشـارو شـارۆچکەکانی هەرێم لەیەک کاتدا بەکۆمەڵ کەوتـنە ڕێ، مـاڵ و حاڵی خۆیـان بەجێهێشت، ئەوەی سەیارەی بوو بەسەیارەکەی ( کەرێژەیەکی کەمبوون لەدانیشتوان)، ئەوی کەرێ، هێـسترێکی بـوو بـاریکرد لەبەتـانی و کەرسـتەی خـواردنی ٣-٤ ڕۆژ و ئەوی نەسـەیارە نەوڵاخـی بـوو، کە ٩٨ % ی خەڵـکەکە دەبـوون، بەپێ کەوتنە ڕێ. ئەو ڕێگایانەی بەرەو ئێران و بەرەو تورکیا دەڕۆیشتن هێندە قەرەباڵغبوون کە بەهیچ جۆرێ بواری خێرا ڕۆیشتنی نەبوو، نەبۆ پیادەو نەبۆ سوارە. تەماشات بکردایە تابلۆیەکی عەنتیکەت دەبینی کە لە دیمەنـی ئەفـلام کـارتۆن دەچـێ. ئەوە ژنـێکە دەڕوا و منـاڵێکی بەکـۆڵەوەیە. لەتەنیـشتیەوە منـاڵێکی خـۆی دەڕوا کە تەمەنـی ١٠-١٢ ساڵە، برایەکی دووساڵی خۆی گرتۆتە کۆڵ. ئەو گوێدرێژێکە بارکراوە بەهێنـدی خـواردن وقـاپ و قاچـاخ و بەتـانی و پیـاوێکی پیـریش بەسەربەتانیەکانەوە ئەلەرزێتەوە دەم بەدوعـاوە : یارەبی خوایە بەسلامەتی ئێمە وئەم خەڵکە لێقەوماوە بگەیەنیت، سەلامەت بین لە تۆپ و تەیارەی سەدامی بێدین. ئەوە پیاوێکی ٤٠ ساڵی پیرەژنێکەی دایکی گرتووە بە کـۆڵەوەو دەڕوات، هاوسەرەکەیشی کـۆڵێ بەتـانی و خـواردنی کـردۆتە کـۆڵ وکـچە گەورەکەیـشی بـرا بچـوکەکەی خـۆی بەکـۆڵەوەیە. ئەوە خێزانێکی حەوت نەفەری خۆیان خزاندووتە نـاو سەیارەکەیان و قەرەباڵغی ڕێگەیـان نـادات خێراتـر لەپیادەکـان بـڕۆن، کەیبـانوو لـۆمەی مێـردەکەی لەسەر ئەوە دەکات سەیارەی هێناوە، دەڵێ :" ئەگەر بەپێ بهاتاین زووتر دەگەیـشتین"، مێـردیش وەڵامـی دەداتەوە:" ئـاخر سـەیارەم لای کـێ جێبـێڵایە؟ ئەگەر خـوا بۆمـان بنووسـێ و بگەڕێیـنەوە ئەوکـات دەمـانووت" ئـێمەش ڕۆژێ لە ڕۆژان سـەیارەمان هەبـوو". ئەوە خێزانێکـی شـەش کەسـی کەشـمەکی خۆیـان کـردووە بەشـەش کـۆڵ و هەموویـان

توانـــای رۆیـــشتنیان باشـــەو دڵخۆشـــن بەوە کە وردە وردە پـــێش قەرەباڵغەییەکە دەکەون. لەوکاتەدا یەک کیلۆمەتر لە پێشکەوتن زۆر گرنگ بوو. پێشدەکەوت مانای لەمەترسی دوورکەوتەوە. ئەوە لۆرییەکە لە سلێمانی دەرچـوو بەرەو چوارتـا، پـڕە لەژن و پیـاو منـاڵ، خێـزان و خزمانی شوفێرەکەی تێدایە،دەیانبات بەرەو ئێران .

لەوکاتەدا کە سەدان هەزار کەس لە سلێمانیەوە ڕێگەیان گرتبوو بەرەو ئێران، لەهەمان کاتدا تاکو تروکیش لەدەرچوانی ۱۹۸۸ بەرێوەن لەدەرەوە دەهـــاتنەوە بەرەو شـــارەحەیاتەکە.. (۳) کەس لەوانە گەیـــشتنە نـــاو شارۆچکەی چوارتـا و بیستیان سوپای سـەدام ئەو بەیـانیە هـاتۆتە نـاو سلێمانی و خەڵـک رایـانکردووە. ریشچەرمووی ۳ کەسەکە بەدوانەکەی تری وت:

-مەخابن ئێمە فریای ئەو جەژنە نەکەوتین، دەبێ لێرەوە بگەڕێینەوە بۆ دواوە .

-وایە، هیچ چارەیەکیترمان نیە.

-سەیارەی تایبەت؟

-ئەوە لەرۆژی وەهادا زۆر زەحمەتە ئەگەر مەحاڵ نەبێت، لۆریش بێ هەرمەمنونین، برادەری ریشچەرموو لە سەرجادەکە چاوی کەوت بەدوو دەبەی(۲۰)لیتری بەنزین بۆ فرۆشتن، زانی کەلە ڕۆژی وەهادا نرخی بەنزین هەموو سەعات بەرز دەبێتەوە، لەبەر ئەوە هەردوو دەبەکەی کڕی، وتی:

-بەوهیوایە جێگەمان لەسەیارەیەکدا بۆ پەیدا کات.

دوای دووسەعات شۆفلێ لەرێگەی سلێمانیەوە هات، گەیشتە چوارتـا بەرەوپێنجوێن، دەستیان لێهەڵبڕی:

-جیگەت هەیە سوارمانکەیت بەکرێ؟

-هیچ جێگەم نیە .

-لەباتی پارە بەنزینت دەدەمێ .

-شوفێری شۆڤڵ گوێی لەوشەی بەنزین بوو، چاویشی بەدوو دەبە بەنزینەکەکەوت، تۆنی قسەکردنی گۆڕی و بەنەرمییەوە وەڵامی دانەوە:

-ئەو دوودەبەیە پڕن؟ ئەگەر پڕبن بەو دوودەبەیە دەتانگەیەنمە ناڵپارێز .

-قبوڵمانە،، بەڵام تا پێنجوێن.

-ئیشم لەناڵپارێزە، ناگەمە پێنجوێن.

-بەهەر حاڵ بێ رێکەوتن و شوڤڵ لە ناڵپارێز وەستاو ٣ زەلامەکە دابەزین، لەناوقاعەیەکی چۆڵی گەورەدا جێگەیان دەستکەوت و لە تێکەڵەیەکی ٨-٩ خیزانی لە ژن وپیاو ومناڵ پێکدێن، لەسوچێکی قاعەکەوە دوو ئافرەت دانیشتبوون لەدەوری ساجێک کە داربەرووی وشکی لەژێردا دەسووتا،کولێرەیان دەکرد وبەگەرمی بەشی هەموو کەسیاندەدا، دیارە ئەو خێزانەکە کولێرەیان دابەش دەکرد فەردەیەک ئارود وداریشیان خستبووە سەیارەکەیان.



مـن هەرچیم نووسیوە دەربارەی کۆڕەو تەنها گۆشەیەکی ئەو رووداوانەیە، کارەساتی کۆڕەو زۆر لەوەزێتر بوو کە شەخسێ بەتەنها بتوانێ باسی بکات و ئەگەرنووسەرێ بیەوێ شتێکی تێرو تەسەل بنوسێ دەبێ ٢-٣ ساڵ تەرخان کات بۆ چاوپێکەوتنی بەشداران لەو کۆڕەوەدا لە زاخۆوە هەتا خانەقین. بیستومە، بەڵام نەمتوانی ئەو لێکۆڵینەوەیە ئەنجامبدەم کەئەمە راستە، وتیان: پلەی هیلاکی و نازارونارەحەتی لای دایکێک کە کۆرپەکەی خۆی بەباوەشەوە بوو گەیشتنە رادەیەک کەلەسەرپردێکەوە کۆرپەی شەش مانگی گرت بەدەستەوەو روویکردە ئاسمان، واتە لەگەڵ خوا قسە دەکات، وتی:

-پێم بڵێ گوناهمان چییە وات لێکردین؟ ها! ئەوەش بەرەوە بۆخۆت!

کورپەی بەزیندوویی فرێدایە ناو روبارەکە و جێهێشت. دیارە ئەو ژنە خوای بەبەرپرس دادەنا لەکارەساتی کۆڕەوو ئەنفال و کیمیابارانی کورد. بۆیە هێندە بەتورەیی ونارەزایی قسەی لەگەڵ خودا کرد.

کۆڕەو یەکەم شەوی خۆی بەسەربرد لەدەرەوەی شارو شارۆچکەکان، هەرتاقمەو بەشێوەیەک و لە جێگەیەک، گرنگ ئەوەبوو لە دەست پیاوکوژانی سەدام رزگاربوون، بام هەتا بەیانیش لەژێر بارانی نیساندا دانیشتن. هێندێ بەتێری و هێندێ بە پرسێتی، هێندێ بە وشکی و هێندێ بەتەڕی، بەیانی ٣ ێی نیسان ماراسۆنی کۆڕەو دەستی پێکردەوە بەرەو ئێران یا بەرەو تورکیا، بەتایبەت لەمرۆوە کامێرای رۆژنامەنوسانی بیانی لێرەو لەوێ پەیدابوو، وێنەی ئەم حەشاماتەیان دەگرت و بەفەوری دەیانتارد بۆ رۆژنامەو تەلەفزیۆنەکانیان. ئەی چۆن ئەمە ناکرێ؟ ئێمە لەسەردەمی گلۆباڵ( عەولەمە) دا ناژین؟ کۆڕەوی ملیۆنی کوردی عێراق، لەترسی دیکتاتۆری بەغدا بوو بە هەواڵی یەکەم و دیارترین ئەدرەسی رادیۆ و تەلەفزیۆن و رۆژنامەی هەموو وڵاتانی جیهان. ئەم دیمەنە دڵتەزێنە رای گشتی جیهانی جووڵاند و زۆر لەدەوڵەتانی ئەم سەرزەمینەش ناچار بوو لەبەرژەوەندی کورد قسە بکات.

سەدام بێ ئەم کۆڕەوەش کەوتبووە هەڵوێستێکی لاواز، پاش ئەوەی جەنگی کەنداوی دۆڕاند. بەم کۆڕەوەش کە هەراو هوریایەکی زۆر گەورەی لە جیهاندا نایەوە، کەوتە هەولێستێکی حەرجتر و دەوڵەتانی هاوپەیمانیش بەسەرۆکایەتی ئەمریکا..هتد.

# جیابوونەوەی شیوعیە کوردەکان لە حشع

لە سەرەتاوە حشع وەکو حیزبێکی نومەمی هاتە کایەو هیچ لەکەیەکی نەتەوەپەرستی پێوە نەدەبینرا. بەڵام ساڵانی پاش بەخۆماڵی کردنی کەناڵی سویس و دەستریژی سێقۆڵی بەریتانیا - فەرەنسا - ئیسرائیل بۆ سەر ڕژیمی جمال عەبدول ناسر لە ١٩٥٦ دا شەپۆلێکی توندی بیروبۆچوونی نەتەوەیی هات بەسەر جیهانی عەرەبدا. ئەو شەپۆلە ڕەنگدانەوەی خۆی هەبوو لەناو حشعیشدا. هێندێ لەسەرکردە شیوعیە عەرەبیەکان دەمارگیری نەتەوەییان جوولا، هۆکاری لاوازی و تێشکانی حشعیان دەگەڕاندەوە بۆ ئەوە کە کورد پۆستی سەرکردایەتیان قۆرخکردووە، لە کاتێکدا کە عەرەب زۆرینەی دانیشتوانی عێراقن و دەبێ سکرتێری حیزب لە زۆرینەی خەڵکی عێراق بێ. سکرتێری حشع کۆچکردوو عەزیز محەمەد تەسلیم بوو بەم هزرە نەتەوەییە ئەنتی نومەمیە - ئەنتی دیموکراتیە و تۆمارکرا لە بەڵگەنامەیەکی فەرمی حیزبدا. کاردانەوەی ئەوانە + کەڵەکەبووی هەڵە لە دوای هەڵەی حشع و توڕەبوونی شیوعیەکان لە سەرکردایەتی و پاشکۆگەریەکانی پاڵینا بە ژمارەیەکی گەورە لە کادری حشع بۆ جێهێشتنی ئەو حیزبە و دروستکردنی حیزبێکی مارکسی - نەتەوەیی بەناوی " پارتی کاری سەربەخۆی کوردستان " ئەم حیزبە تەمەنێکی کورتی بوو، لە ئەنجامی کۆمەڵێ کێشە و ململانێی ناوخۆدا هەڵوەشایەوە.

هەر لەکاتی جیابوونەوەی پارتی کاری سەربەخۆییدا، لەپاش ڕاپەڕینی ١٩٩١، کۆمەڵێکی تر لە شیوعیە کوردەکان جیابوونەوە بەشێوەیەکی جیاواز، بەناوی ( حیزبی شیوعی کوردستان ) ە وە، لەگەڵ پاراستنی تەبایی و پێوەندی هاوڕێیانە لەگەڵ حشعدا. ئەم حیزبە نەیتوانیوە گەشەبکات، بەڵکو بچوکتر بۆتەوە.

لێرەدا پرسیارێ دێتە ئارا : ئایا جیابوونەوەی شیوعیەکانی کوردستان لە حشع و دامەزراندنی حیزبێکی شیوعی تایبەت بە خۆیان شتێکی بەجێ بوو، یان هەڵە بوو؟ هێندێ لە شیوعیەکان پشت بە قسەی لینین دەبەستن کەوتویەتی ( نابێ دو حیزبی شیوعی لە وڵاتێکدا هەبێ )، دەڵێین بەڵێ ئەمە هەڵەیە. من بۆ چونێکی ترم هەیە. لینین ئەو قسەیەی پێش سەدساڵ کردوەو لەدۆخێکی جیاوازدا. ئەوە دەیەها ساڵە دووحیزبی شیوعی لە هیندا هەیە و ئاسمانیش ئەروخاوە بەسەر زەویدا ! ئەگەر دوحیزبی شیوعی لە کەشێکی دیموکراتیدا هەبوایە، وەکو دوحیزبی بۆرژوازی هەیە لە ئەمریکا، ڕژێمی سۆڤیەتی بەو دەردە نەدەچوو. خۆزگە ئێستە لە چین، لە ڤێتنام، لە کوبا، دووحیزبی مارکسی هەبوایەو لە ململانێیەکی سیاسی ڕێکوپێکدا بوایەن، هەڵەو کەمو کوڕی یەکتریان باسکردایە، موناڤەسەی یەکتریان بکردایە لەسەر کورسی دەسەلات ! لەوە پێش بردنی ڕژێمی سۆشیالیستی و گەشە پێدانی گوزەرانی هاولاتیان.

# ٢٧ ساڵ هێڵی چەوت و غەدر

سەرانی پارتی ویەکێتی ١٢ ساڵ (١٩٩١ - ٢٠٠٣) وەکو حکومەتێکی تەواو سەربەخۆ ئەم هەرێمە یان بردووە بەرێوە، ئەوە(١٥)ساڵیشە هەر خۆیان لەچوارچێوەی عێراقدا بەرێوەیان بردووە، ئێمە دەپرسین :

لەم ٢٧ ساڵەدا چیتان بەدەستهێناوە بۆ ئەم میللەتە؟ بۆچی لە ٢٧ساڵدا نەتانتوانی کارەبا بۆ ئەم خەڵکە دابین بکەن؟ لە ٢٧ ساڵدا چیتان لە پیشەسازی هەرێم پیشخست؟ چیتان لە پرۆژەی دیموکراسی پێشخست؟ فایلی نەوتی هەرێم و داهاتی هەرێمتان گرتە دەستی خۆتان لە ٢٠١٤ ەوە موچەی مامۆستایان و فەرمانبەرانتان بڕی.. چیتان لەپارەی ئەم میللەتە کرد؟

ئەگەر سەرانی پارتی و یەکێتی، لەپاش راپەرینی ١٩٩١ ەوە، بناغەی حوکمڕانیەکی دیموکراتی شارستانیان دا رشتایە ئەوە شکۆیەکی مەزنیان بۆ خۆیان تۆماردەکرد لە مێژووی میللەتەکەیاندا. بەلام سەد مەخابن ئەوی کردیان شتێکیتربوو، مێژوویەکی ناشیرینی بۆتۆمار کردن، لەخوارەوە باس لە چەند خاڵێ دەکەم، کە کردیان بە رێرەوی سیاسی – حزبی خۆیان لەم ٢٧ساڵەدا. ئەوەش بەروبوومەکەیەتی کە میللەتەکەمان خواردی، خۆیشیان تا ئێستا باجەکەیان نەداوە بەڵام هەر دەبێ بیدەن، زوو بێ یان درەنگ:

# بنەماڵەچێتی

"بنەماڵە : یان " خانەدان " زاراوەیەکی کۆمەڵگەی خێڵەکی ( یان دەرەبەگایەتی )یە، ئامـاژە بـۆ ئەوە دەکـات کە خێزانـی نـاوبراو تایبەتمەنـدی خـۆی هەیە لە کـۆمەڵگەدا، واتە لەئاغاکـان یـان بنەماڵەیەکی ئایینی ناسراو یان لە شێخانی تەریقەت یان بازرگان... هتد. بنەماڵە لەدنیای حیزب وسیاسەتدا بەو مانایە دێت، کە جۆرێ لەمەرجیعیـەت دروسـتبکرێ بـۆ حیـزب وەک مەرجیعیەتـی ئـایینی شـیعەکان یـان وەک سـەرۆکی خێـڵ کە قـسەی لەسـەرووی هەمووشتەوەدەبێت.

سەباردت بە برایانی پارتی مەلا مستەفا هەر لە سەرتاوە، بەرلەوەی بێتە ناو پارتی، سەرۆکی عەشرەت بووە، ئەگەر چی شێخ ئەحمەدی کاکی شێخی تەریقەت و سەرۆکی باڵای عەشرەتەکە بوو. شتێکی سروشتی بـوو، کە مەلا مـستەفا لەنـاو پارتیـشدا هەر بەعەقڵـیەت و شـێوازی عەشایەری بجوڵێ. بەڵام سروشتی نیە، کە لەمرۆدا کاک مـسعود بە عەقلیەت وشـێوازی بـاوکی کـۆچکردووی بجـوڵێ و هەمـوو پۆسـتە سەرەکییەکانی دەسەڵات دابەشکات بەسەر بنەماڵەکەی خۆیدا.

بـاڵی مەکتەبـی سیاسـی پـارتی بەسەرۆکایەتی حمزە عبداللە و دواتـر سـەرۆکایەتی ئیبـراهیم ئەحـمەد بەشـێوەیەکی شارسـتانی، دوور لە عەقلیەتی عەشایەری دامەزرێنراو.هەروەهاش مایەوە، کە جلال تالەبانی ئەم بـاڵەی بەنـاوی(ی.ن.ک) وەنـوژەنکردەوە لەپـاش ئاشـبەتاڵی ١٩٧٥ هەردوور بـوولە شـێوازی عەشـرەتگەریەوە، بەڵام جلالـیش لەکاروبـاری سیاسـی خۆیـدا پێوەنـدی عەشـایەری لەبیرنەکردبـوو، بەپـێچەوانە، ئەوەی نـاوی لێنـابوو(هێلـی پـان) لە ینـک دا لەپـلەی یەکەمـدا پێوەنـدیە عەشایەریەکانی بوو، بەکاریگەری ئەم پێوەندیانە بێ یان هەر هۆیەکیتر

جلال تاڵەبانی هەنگاوی نا لەسەر ڕێگەی بنەماڵەچیتی بەناردنی قوبادی کوڕی وەک نوێنەری یەکێتی بۆ واشنتون، ئەمە لەکاتێکدا کە لەناو ینک دا کەسانی بەتوانا تر و شایستە تر هەبوون، قوباد گەنجێکی کەم تەمەن و کەم ئەزموون بوو.

بنەماڵەچێتی لە حیزبێکی وەکو پارتی یان یەکێتی لەدۆخی ئەم ولاتەی ئێمە مانای چیە؟ مانای وایە کە مرۆڤێ یان خێزانێ هەیە کەڵکی شەخسی لەو حیزبە وەرگرتووەو بەرژەوەندی خۆی لەوەدا دەبینێ کە ئەو حیزبە وەک ملکێکی تاپۆدار بەکار بێنی بە بەرەوەژندی شەخسی و خێزانی خۆی، لەبەر ئەوە لەناو خەڵکی ئەم هەرێمەدا هەستیاری دروستبووە بەرانبەر هەردوو بنەماڵەی بارزانی وتاڵەبانی.

# حیزبایەتی تەسك

حیزب ئامێریکە بۆ ڕێخستن و ئاراستەکردنی بزوتنەوەی سیاسی – کۆمەڵایەتی لەوڵاتدا بەشێوەیەکی گونجاوتر لەگەڵ بەرژەوەندی گشتی گەل و نیشتمانەکەیان. ئەو کەسانەی حیزبی ڕاستەقینە دروستدەکەن و بەرنامەیەکی بۆدادەڕێژن بەمە بەستی خزمەتی گەل ئامادە دەبن هەمو جۆرە قوربانیەکیش بدەن لەپێناوی گەلەکەیاندا. بەڵام لەوڵاتە دواکەوتووەکاندا جۆرێکی دیکەش لە حیزب پەیدا بووە کە دروستکراوە بۆ ئامانجێکی دژ بە گەل، کە خەبات و قوربانی ئەم جەماوەرەی کردووە بەپەیژە بۆ گەیشتن بە کورسی دەسەڵات و سامانی میللەت، حیزبابەتی تەسک ڕێرەوەی ئەم جۆرە کەسانەیە کە هاوڵاتیانی ئەم هەرێمە نموونەی زیندوویان لەم دووحیزبە دەبینێ کە ٢٧ ساڵە جڵەوی دەسەڵاتیان لەدەستدایەو وڵاتیان گەیاندووتە ئەم حاڵەی هەمووماندەیبینین، حیزبی نیشتمانی شارستانی کە بۆخزمەتی گەل و نیشتمان دروستکرابێ هەمو جموجوڵێکی دەخاتە گەڕ بۆ پاراستنی بەرژەوەندی گشتی کۆمەڵگە، بەپێچەوانەوە ئەم حوکمڕانانەی ئێمە کەلەم ساڵانەی حوکمڕانیاندا بوون بەکۆمەڵێ لە ملیاردێری گەورەو فەرمانبەرانی هەرێمیش مووچەی مانگانەیان نیەو منداڵەکانیان بەبرسێتی سەردەنێنەوە!!

حیزبایەتی تەسک بەزەقی ئەوەیە کە پاش ٢٧ ساڵ لە حوکمڕانی و هەتا ئێستەش دەسەڵات لەدەستی سەرۆکی حیزبدا بووە، ڕێگە لەدەستا و دەستی دەسەڵات گیراوە، ئەوەیە کە حیزب لە سەرووی دەوڵەت و یاساوە بووە ولەباتی سوپای دەوڵەت هەر میلیشیای حیزبی ماوەتەوە، ئەوەیە کە پەرلەمان دەزگایەک بووە بەدەستی سەرۆکی حیزبەوە، کە فایلی نەوت و هەر پرسێکی گرنگی ئابووری تەنها لەژێر سەرپەرشتی سەرۆکدابوو، کە ملیاردەها دۆلار دزراوە و نەلێپرسینەوە لەگەڵ کەس

کراوەو نەیەک دزیش لە گەورەکانیان خراوەتە بەندیخانە، ئەوەیە کە وەرگرتن لە زانکۆ و لە خوێندنی باڵا و لەپۆستی بەرپرسیارێتی هەردایرەیەک یان قوتابخانەیەک، بەڵکو لە تەعین کردنی فراشێ یان پاسەوانێکیش، لەسەر هەویەی حیزبی ( زەرد یان سەوز) بووە، کەس لە توانا و دەسپاکی و دڵسۆزی نەپرسیوە. دەزگای دەولەت بە گشتی کراوە بە دەزگایەکی حیزبی، بەرپرسانی کۆمیتە حیزبیەکانیش کە هیچ پۆستێکی حکومیان نەبووە بەئارەزووی خۆیان ئازادبوون لەدەستێوەردان لەکاروباری دەوڵەت. بەم شێوە حیزب و دەوڵەتیان تێکەڵ بەیەکترکرد. ئەمەش خواستی سەرۆکی باڵابوو بەو مەبەستە کە خوی بە تەنیا بەرپرسی هەرەباڵای حیزبیش و حکومەتیش بێ. واتە تاکەکەسی سەرکردەی باڵای حیزب و دەوڵەت بێ و سەرکردایەتی بەکۆمەڵ لەبەرنامەی حیزبدا بۆ جێبەجێکردن نەنووسرا بێ.

# قۆرخکردنی دەسەڵات

قــۆرخکردنی دەســـەڵات دژایەتـــی ژیـــانی دیموکراســـیانەیە لە کۆمەڵگەدا. بەوشەیەکیتر دیمورکاسی ئەوەیە کە ژیانی فرەحیزبی و ئـــازادی هەبـــێ، لەگەڵ هەڵبژاردنـــی پەرلەمـــانی ئـــازادو شـــەفاف. لەئەنجامیشدا ئەو حیزبە ( یان ئەو حیزبانە) کە زۆرینەی کورسیەکانی پەرلەمـــان دێنـــی حکـــومەت دروســـدەکات. رێـــگەش بـــۆ دەستاودەســـتی دەســـەڵات بەکراوەیـــی دەمێنـــی. ئەگەر لە هەڵبژاردنـــی پەرلەمـــانی داهـــاتوودا حیزبێکـــی دیـــکە ســـەرکەوت ئەوئەو حکـــومەتی نـــوێ دروستدەکات. ئەگەر حیزبی حوکرانیش بۆجاری دووەمیش زۆرینەی کورسیەکان بەدەسبێنێ ئەوە دەسەڵات هەرلە دەستی خۆیدا دەمێنی، وەکو لەهەمـوو وڵاتێکـی دیموکراتی راستەقینەدا دەبینرێ. بەڵام لە هەرێمی کوردستاندا بەم شێوەیە نەبووە، لێرە ئەوە ٢٧ ساڵە سەرانی پارتی و یەکێتی دیموکراسیان پێشێلکردووە، هەمـوو جۆرێ لە دەستاودەستی دەسەڵاتیان رەتکردۆتەوە، بەناهەق دەستیان گرتووە بەسەر دەسەڵاتدا، دەسەڵاتیان بەو ئاراستەیە بردووەکە بەرژەوەندی تایبەتی خۆیانی بۆ دابینکردوون و قیرسیا لەم گەلە ! کارەبا بۆ میللەت نیە چش، بۆخۆیـــان هەیە، فەرمـــانبەرە و مـــووچەکەی بـــڕاوە چـــش ! خۆیـــان کەمدەرامەتیان نەدیوە!

سەرانی پارتی و یەکێتی لە ئەسڵدا سەرانی یەک حیزب بوون و پێکەوە ئیدارەیان نەکرد، کەرتبوون. شەڕی براکوژی لە ١٩٦٤ وە بۆ ١٩٩٧ بۆئەوە بووە کە یەکێکیان ئەویتر لەناو ببات و خۆی بەتەنیا شۆڕەسواری گۆڕەپان بێ، بەتەنیا هەمـوو هەرێم قورخکات، بەڵام ئەمە سەرینەگرت و ناچـــاربوون بەدووقـــۆڵی گۆڕەپـــانی هەرێـــم قـــۆرخکەن و بەرگـــری لەبەرژەوەندی هاوبەشیان بکەن.

شەڕی براکوژی و گەندەڵکاری دارایی و ئیداری دەیەها ساڵ و زنجیرەیەکی درێژ لە هەڵەی جۆراوجۆر پارتی و یەکێتی گەیاندووتە قەیرانێکی ترسناک و ئایندەیەکی نادیار. ینک ئەمرۆ بریتیە لە چەند باڵێکی پەرتەوازە و لەم دواییەدا جیابوونەوەی د. بەرهەم ئالح گورزێکی کاریگەر بوو ئاراستەیانکرا، پێناچی کێشەکانی ناوخۆیان بۆچارەسەر بکرێ، لەپارتیشدا ناکۆکی وکێشە کەوتۆتە ناوخێزانی بنەماڵەو ئەگەر مسعودبارزانی نەبوایە ئیستە حاڵیان زۆر خراپتر دەبوو.

لە جیهانی ئەمرۆدا کەبە چەرخی گلۆباڵ ( عەولەمە ) ناودەبرێ ئەو پێوەرەی کەپلەی پێشکەوتنی کۆمەڵگەی پێ دیاری دەکرێ، بەر لە هەمووشت، پرسی دیموکراسیە. لە کوێ دیموکراسی گەشەی کردووە و ڕیشەی داکوتاوە لە ژیانی کۆمەڵگەدا لەوێ کەشتی گەیشتۆتە کەناری ئاشتی و ئارامی. لە کوێش لە باتی دیموکراسی بە شێوەیەکی تیرۆرو دکتاتۆریەت وڵات بە ڕێوە دبرێ لەوێ کارەسات و وێرانکاری و خوێنڕشتنە. هەمووان دەزانن دکتاتۆریەتی فاشی هیتلەر و موسولین ئەو دو وڵاتەو هەموو جیهانی بە کوێ گەیاند. دکتاتۆریەتی بەعسی عێراقی چی بەسەر کورد و هەموو عێراق و ئێران و کوێتدا هێنا. دکتاتۆریەتی بەعس و ئەسەدی باوک و ئەسەدی کوڕ چیان لە سوریا نەکرد، دەزانن سەرانی پارتی و یەکێتی لە ٢٧ ساڵی حوکومڕانی خۆیاندا ئەم هەرێمەیان بە چ دەردێ بردووە، بە ڕیفراندۆمە کارەساتە کەیان چ زیانێکیان لەم میللەتەدا.

با تەماشایەکی نەخشەی سیاسی – جوگرافی ئەوروپا بکەین تابزانین کام لەو وڵاتانە لە حاڵێکی باشتردان لە هەموو ڕوویەکەوە؟ هەر ئەو وڵاتانە نین کە دیموکراسیان تێدا گەشترو پێشکەوتووترە؟ ئەگەر ئەو دیموکراسیەی لە سویدا هەیە لە عێراقیشدا هبوایە. لەباتی جەنگ و کاولکاری و خوێن ڕشتنی ٣٥ ساڵی حکومڕانی سەدام ئێستا

عێراقیەکان، بە کوردو عەرەب و هەموو پێکهاتە کانیەوە، چۆن دەژیان؟
ئێستە ئەم وڵاتە چەند گەشەی کردبوو لە هەموو ڕوویەکەوە؟

سەرانی پارتی و یەکێتی لەوە تێگەشتوون کە ئەگەر ڕژێمێکی دیموکراسی لەم وڵاتەدا هەبوایە مەحاڵبوو ئەم ٢٧ ساڵە لەسەر کورسیەکانیان بمێنن، مەحاڵبوو پاش چوار ساڵ لە شەڕی برا کوژی نەوەدەکان هەرخۆیان دەسەلاتداربن، مەحاڵبوو پاش ئەو هەموو گەندەڵکاریە هەرلە جێگەی خۆیان بن، مەحاڵبوو پاش نەدانی مووچەی فەرمانبەران بە درێژەی چوارساڵ هەر خۆیان بن، مەحاڵبوو پاش کارەساتی ئەو ڕفراندۆمە ناوەختەی ئەیلولی ٢٠١٧ بتوانن دانیشن بێ لێکۆڵینەوە....هتد.

سەرانی پارتی و یەکێتی مافی کوردیان دەوێ بەومەرجە هەرخۆیان حوکمڕان بن. فەرمانبەرانی هەرێمیش دەڵێن : ئەگەر حوکمڕانی کورد ئەوە بێ کە مووچەیان نەدرێتێ و منالەکانیان بەبرسیەتی سەربنێنەوە با یەکێکی وەکو عبادی حوکمڕان بێ ! ئێمە چی لەو حوکمڕانە کوردە بکەین کەمووچەکانمان نەداتێ، خۆشگوزەرانیمان بۆ دابیننەکات، ئازادی و دیموکراسیمان پێڕەوا نەبینێ.

# نمونە لە قەسابخانەکانی
# پارتی و یەکێتی لە کوردستاندا

لێرەدا باسی ئەوانە ناکەین کە لەشەڕی دژ بە ڕژێمدا شەهید بوون، باسی هەزاران لاوی کورد ناکەین کە لەشەڕی برا کوژی پارتی و یەکێتیدا، لە پێناوی کورسی و پارەدا، کوژراون.. باسی ئەوانە دەکەم کە هیچ گوناهێکیان بەرانبەر پارتی و یەکێتی نەبوە، مەگەر هەر ئەوە بێ کە کارو کرداریان بە دڵی سەرانی ئەم دو حیزبە نەبووە، یان داوایان لێکراوە فلان کەس بکوژن و ئەومیان نەکردووە. ئەمەش کە لێرەدا دەنووسرێ بەشێکە لەو تاوانانە، هەمووشی کوشتنی سیاسیەو قسەمان لەسەر کوشتنی عەشایەری نەکردووە کە ئەوانیش کەم نین.

**١-قەسابخانەی کانی ماسی – سلێمانی:**

لە ١٩٦٤ دا لە شاری سلێمانی باندێکی شیوعیکوژ، کە تێکەڵەیەکبوون لە تاوانبارانی سەر بەپارتی و سەربە ئەمنی عێراقی، یان سەر بەهەردووکیان وەک عقید صدیق، چاخانەی کانی ماسیان کردبوو بە بارەگای خۆیان. عەقید بەناوی " نوێنەری تایبەتی مەلا مستەفاوە لە سلێمانی جموجوڵی دەکرد وتاوانەکانی بە جێدەهێنا.

ئەم باندە هەریەکە مووچەی مانگانەی ( ١٥ ) دینار لە ئەمنی بەغدا و دەمانچەیەکی چواردەخۆریشی دەدرایە کەسیش لێپرسینەوەی لەگەڵ نەدەکردن لەسەر دزی و تالانی کەبەشێکی زۆری ئیشەکانیان بوو.

ئەو باندە زۆری لە شیوعیەکانی سلێمانی گرت و کوشت، لە ناویاندا :

١-ئەندامی کۆمیتەی پارێزگا ئەوڕەحمانی ساڵحی خلە کەبەئەشکەنجە کوشتیان و سووتاندیان. ٢- مەلا حەمە ئەمین. ٣- عومەری مام

عەلی. ٤- عوسمان سەیوانی. ٥ - مەحمود برنج فرۆش. ٦- نوری حەمە عەلی. ٧- عارف حسێن کۆپاندروو. ٨- عەبدولڵای موزەمید.

٩- مەحمود سەید عەلی دڕەیی کە لەبەندینخانە بەردرا و گەیشتە ماڵی خۆی کۆمەڵێ چەکداری باندەکە گەیشتنە سەری بەبەرچاوی خێزانەکەیەوە کوشتیان. ١٠ - تەقەیان لە کەریمی عەبە خرە و سمایل پاڵەوان کرد بۆ کۆشتن، برینداربوون و نەمردن بەڵام یەکەمیان کەمنەندام بوو. ١١- سێ کەسی تریشیان فڕاند تابیانکوژن، کۆمەڵی خزمانیان فریاکەوتن و بەپارە و بە واسیتەو بەهەڕەشە ڕزگاریان کردن. ١٢- چوونە سەر شێخ عەلی نایب زابت بۆ کوشتنی. چەکەکەی خۆی هەڵگرت و بەرگری لە خۆی کرد و راوینان.

شایەنی باسە کەئەو کاتە سکرتێری لقی کوردستان عەزیز محەمەد سکاڵای لەسەر دەستدرێژی ئەم باندە لای مەلا مستەفا کرد. بەڵام گوێی لێ نەگیراو کەڵکی نەبوو دوای ئەوەش شێخ لەتیفی حەفید سکاڵای گەیاندە بارزانی و داوای لێکرد کۆتایی بەم جۆرە ئیشانە بێنێ.

**٢-قەسابخانەی دژ بەکادرو پێشمەرگەی ڕۆژهەلات:**

لەساڵانی ٩٦٧ ـ ٩٦٨ دا، لەسەردەمی ڕژێمی شادا، لە باتی پشگیری لە خەباتی برا کوردەکانی ڕۆژهەلات، مەلا مستەفا کە سەرۆکی پارتی بوو شالاوێکی سەرکوتکردن و کوشتنی دژ بە پێشمەرگەکانی ئەو بەشەی کوردستان ئەنجامدا. لەخوارەوە ناوی بەشێ لەو شەهیدانەیە :

١ـ سلێمانی معینی ( فایق امین ) کادرێکی فیداکارو چالاک ڕێکەوت لەگەڵ سەرەک جاشی بێتابرو قالە تەگەرانی کە یارمەتی بدات تا بەسەلامەتی دەگاتە ئەودیوی سنوور، قالە بردی و تەسلیمی

مەلا مستەفای کرد. ئەویش کوشتی و تەرمەکەی بە ( دیاری ) نارد بۆ ساواکی شای ئێران. ٢ـ خلیل شوباش. ٣ـ اسماعیلی شریفزادە. ٤ـ عبدللە ی موعینی. ٥ـ مەلا ئاوارە ( مەلا احمدی مەلا حەمەئەمینی هەمەوەندی ). ٦ـ مەلا ڕەحیمی وەرتی ( میرزا احمد ). ٧ـ سالّح لاجانی و هاوڕێکانی، دەیان پێشمەرگەی دیکەش.

ئەمانە پێشمەرگەی دڵسۆزو ئازای حیزبی دیموکراتی کوردی ئێران بوون، بەقەد تاڵە موویەکیش خراپەیان نەکردبوو، نەبەرانبەر پارتی و بەرزانی نە بەرانبەر هیچ کەسێ. تاکە هۆکاری کوشتنیان ڕازیکردنی شای ئێران بوو.

**٣-کوشتنی دوو کادری کوردی باکور – سعید ئاڵچی و دکتۆر شڤان:**

ساڵی ١٩٧١، بە سیناریۆی میتی تورکی دوکادیری پارتی دیموکراتی کوردستان . تورکیا، سعید ئاڵچی و دکتۆر شڤان کوژران و ئاشبەتاڵ بەو پارتە کرا .

سەرەتا پاراستن لە گوندی قومری، لە دیوی کوردستانی باشور، سعید ئاڵچی کوشت. دوایی بە بیانووی ئەوەی دکتۆرشڤان سعید ئاڵچی کوشتووە، بە فەرمانی بەرزانی، خرایە بەندینخانەی ڕایات و پاش چەند مانگێ گولە بارانکرا.

باشە بە چی لۆژیکێ کوشتن و پاساوی دو کوردی داماو دەدرێ کە ڕێیان کردووەو لە باکورەوە هاتوون بۆ باشور، بۆسەردانی سەرکردایەتی شۆڕش و دروستکردنی پێوەندی خەباتگێری و ئاڵوگۆڕی ئەزموون و... هتد؟

**٤-قەسابخانەی دژ بەشیوعیەکان لە ١٩٧٢ دا:**

١٢کادری حشع نێردرابوون بۆ خولێکی یەکساڵی خوێندن لە یەکیەتی سۆڤێت، کە عەرەب و کوردیان تێدا بوو. کە خولەکەیان تەواو کردو گەڕانەوە بەرەو وڵات دەبوو لە ڕێگەی سوریاوە بپەڕنەوە ئەم دیو، بۆ بادینان. لەوکاتەدا، لە ٩٧٣ دا، پێوەندی حشع لەگەڵ پارتی تێکچووبوو. ئەو گەنجانە پێیانوابوو بە گەیشتنیان بۆ ناو خاکی کوردستان پارتی یارمەتیان دەدات بچنەوە ناو کەس و کاری خۆیان.. بەڵام مەخابن بەرپرسی پارتی لەو ناوە عیسا سوار هەموویانی گرت و پاش وەرگرتنی گری سەوز لە بەرزانی باوکەوە بێسەرو شوێنی کردن. ئەگەر ئەوانە لەو کاتەدا بکەوتایەنەتە دەستی ڕژێمی بەعس دەگیران و ئەشکەنجە دەدران، دەخرانە بەندینخانە بەڵام بەو شێوازەی عیسی سوار کردی نەدەکوژران.

**٥-کۆمەڵکوژیی بنەماڵەی حەمەداغای مێرگەسۆر:**

زۆر جێگەی تێڕامانە. حەمەداغا سەرۆکی عە شیرە تی شیروانە بوو کە عە شیرە تیکی گەورەی ناوچەی بلەو بارزانە. حەمەداغا پیاوێکی کوردپەروەری شۆڕشگێڕبوو. لە کۆماری کوردستان لە مەهاباد پلەی سەربازی کۆلۆنێلی درابوویە و سەرپەرشتی بەرەی شەڕەکانی سەقزی کردبوو. دوای کەوتنی کۆمار، لەگەڵ شێخ ئەحمەدی خودانی بارزان گەڕایەوە عێراق. گیراو سزای لەسێدارە دانی بۆ دەرچوو. سزاکەی کرا بە ٢٠ ساڵ و دوای بەسەربردنی ٦ ساڵ، ئازاد کرا. لە هەموو شەڕەکانی ناوچەی بەرزانا بەشداری کردووە. چ لەوانەی لە دژی حکومەت و سوپای عێراق بوون. چ لەوانەی دژی عەشیرەتەکانی دوژمنی شێخانی بارزان بوون. لە شۆڕشی ئەیلول یشا پلەی پێشمەرگایەتی گەیشتە ئامر هێزی سەفین.

فاخری کوڕی حەمەداغا گەیشتە پلەی ئەندامێتی لیژنەی مەرکەزی پارتی. لەکۆنگرەی ٨ ساڵی ١٩٧٠ی پارتیا هەڵبژێردرا. پێشتر ناوبانگی فاخر بەهۆی سەرکردایەتی شەڕە بەناوبانگەکانی ( کۆڕەک ١٩٦٤ و هەندرێن ١٩٦٦ ) وە، هەروەها بەهۆی سەرکەوتنەکانی لە سەرکردایەتی شەڕەکانی نێوان مەلایی و جەلالی دا لە هەموو ناوچەکانی سلیمانی، ناوبانگی هەموو ناوچەکانی کوردستانی تەنی بوو. بەخزمایەتیش تێکەڵی شێخانی بارزان بوون:

دایکی مەلامستەفا. پوری باوکی حەمەداغا بووە. مەحبوبەی ژنی مەلامستەفا، دایکی عەبەیدوڵلا و ئەوان، پوری حەمەداغا بووە. کەچی نە ئازایەتی و کوردپەروەری و شۆڕشگێڕی و نە خزمایەتی دادی نەدان. لەماوەی چەن ساڵێکا بە فەرمانی مەلامستەفا ڕیخ و واری بنەماڵەی حەمەداغا، لەبەر دوو هۆ : ترس لە توانای سیاسی و نفوزیان و ترس لە یەکگرتنیان لەگەڵ عوبەیدوڵلا ی کوڕی لە دژی، لە بن دەرهێنرا و نێرینەیان لێ بڕین :

ساڵی ١٩٦٣ لە بەرەی شەڕی بەرگری کردن لە بەرزان دژی سوپای عێراق، حوسێنی کوڕە گەورەی شەهید بوو.

لە تەموزی ١٩٧١ دا پاراستن لە ناو هەولێرا جەمیلی حەمەداغای کوشت. لە تەموزی ١٩٧٢ دا فاخر و سەعیدی برای و خەڵۆ برادۆستی خزمیان، گیران و بێ سەروشوێن کران. تا ئێستا گۆڕیان ونە. لە نیسانی ١٩٧٢ هەتا دوای ئاشبەتاڵ حەمەداغا و کوڕەکانی : ڕەشید، ئەسعەد، مەجید و جەوهەر لە زیندانەکانی رایات و خەلان زیندان بوون. شەوی ٢٢ی ئازاری ١٩٧٥، واتە سێ ڕۆژ دوای ڕاگەیاندنی ئاشبەتاڵ لە لایەن بارەگای بەرزانیەوە، گولە باران کران و تەرمەکانیان فڕێ دان. دوای چەن ڕۆژێ سۆراخ، خێزانەکانیان تەرمەکانیان دۆزینەوە.

**٦-کێ بەرپرسیارە لە قەسابخانەی کوشتنی هەزارەها بەرزانی لە قوشتەپە؟**

د. محمود عوسمان کە ئەندامی مەکتەب سیاسی پارتی و کەسایەتیەکی دیار و بەرپرسی ڕەوتێ بو بنیاتنانەوەی پارتی بەناوی (اللجنة التحفيرية) لەو کتێبەدا بەناوی ( تقييم مسيرة الثورة الكردية والدروس والعبر منها ٩٦١ ـ ٩٧٥ ) نووسیویەتی :

بەرزانی نەخۆیی و نە کورەکانی ڕۆژێ لە ڕۆژان نەسەریان لە شەرکەیەکدا نە نەخشەیان بۆ هێرشێکی بەرنامەدار یان نەبەردێک یان جەنگی پارێزانی دانا. تەنها جار کە بەرزانی تێیدا چووە بەردی شەڕ ئەو جارە بوو کە بۆ ناوچەی بەرزان چوو بۆ دەرکردنی شێخ عوسمان. شێخ عوسمانی شێخ ئەحمەدی خودانی بارزان، برازای بارزانی باوک، لە سەر دوو شت بارزانی ڕقی لێ هەلگرت : دژی تەوریس بوو بۆ مەسعود بارزانی، بارزانی ئەی ویست شێخایەتیش بکەوێتە دەستی خۆی، موریدەکانی خودانی بارزان بۆنی خودانیان نابو بە شێخ عوسمانی کوڕیەوە.

دوای ئەوەی بارزانی دلنیا بوو شێخ عوسمان بە هیچ هەڕەشەو گەمارۆیەک ناگیرێ، بە سەرۆکایەتی خۆی، لە حوزەیرانی ١٩٧٤ و لە گەرمەی شەڕی نێوان سوپای داگیرکەری بەعس و شۆڕشا، هێزێکی گەورەی بردە سەر شێخ عوسمان و بە خاوخێزان و هەموو مریدو دەروێشەکانیەوە راوینان بەرەو هەولێر و ناچاری کردن تەسلیمی ڕژێمی بەعس ببن.ئەو ٨٠٠٠ بارزانیەی لە قوشتەپە بەعس بردنی و کوشتنی. هەر هەموویان لە نەیارەکانی بنەماڵەی بارزانی بوون میسریەکان پەندێکی جوانیان هەیە بۆ حاڵەتی وا : يقتل القتيل ويمشي في جنازته.

لێرەدا دەپرسرێ : کێ بەرپرسە لە کوشتنی شێخ عوسمان و ئەو هەزاران کەسە لەو بەرزانیانە کە سەدام لە ئۆردوگای قوشتەپەوە بردنی

و کوشتنی؟ ئەگەر ئەو شاڵاوە سەربازیەی مسعود نەبوایە ئەو بارزانیانە ناچار دەبوون ڕاکەن بۆ هەولێر؟

**٧-قەسابخانەیەك بەشێوازی داعشیانە:**

ئەمە قەسابخانەیەکی نەخشە بۆ داڕێژراو بوو لەسەرکردایەتی باڵای ینک وە. لە ٢ / ١١ / ٩٩٥ دا لە بازگەی کۆیە جێبە جێکرا. ئامانجی ئەم قەسابخانەیە کوڕەکەی عایشە گوڵ، ئەو ژنە شیوعیە قارەمانەی کەلەسەر دەستی فاشستەکانی ڕژێمی بەعس لە کۆیە شەهید کرا و دواتر پەیکەریشی بۆ دروستکرا. شەهید محمد حلاق لەسەر ڕێگەی دایکی ڕۆشت، کادرێکی تابلێیت نازاو کۆڵنەدەربوو. بەڵام ئەو قەیرانەی کەوتبوە ناو حشعەوە لە پاش ڕاپەڕین ٩٩١، ئەو حیزبەی لەتلەتکرد و محمد حلاقیش لەگەڵ ئەوانەبوو کە ( پارتی کاری سەربەخۆیی کوردستان ) یان دامەزراند. هەموو هەوڵ و کۆششێکی بۆ ئەوەبوو کە ئەم پارتە بخاتە سەر ڕێگەی خەباتگێڕی خۆی. هەموو ( گوناهیشی ) تەنها ئەوە بووکە سەربەخۆیی سیاسی حیزبەکەی خۆی بپارێزێ و پاشکۆگەری هیچ لایەنێکی تر نەکات. لەگەڵ مەفرەزە ١٠ کەسیەکەی خۆی لە هەولێرەوە بەرەو سلیمانی کەوتە ڕێ و هیچ جۆرە کێشەیەکی لەگەڵ ینک نەبوو هەتا بترسێ و ئیحتیاتی خۆی وەربگرێ. ینکیش لە سەیتەرەی کۆیە هەموو شتێکی ئامادە کردبوو بۆ جێ بە جێکردنی نەخشەی داڕێژراو. لەگەڵ گەیشتنی محمد حلاق بە سەیتەرە ئەمریان پێکرا چەکەکانیان تەسلیم بکەن. پرسیان ئەوان چیان کردووە هەتا چەک تەسلیم کەن؟ وەڵامی بەرپرسانی سەیتەرە تەقەی کلاشینکۆف بوو، دوو کەسی لە مەفرەزەکە شەهید کران. محمد حلاق تێگەیشت کە ینک خواخوایەتی بەرانبەرەکەی تەقە بکات تا بیانوو هەبێت بۆ کوشتنیان. دوایی

یەکیەتی بەیانێ دەردەکات دەڵێ (محمد حلاق دەستی بەتەقە کردو ئەوەنــدە کەســی لە پێــشمەرگەکانی یەــک کوشــت و پێــشمەرگەش ناچــاربوو بەرگــری لە خــۆی بکــات. بەداخەوە ئەوەنــدەش لە ئــێمە کــوژران). بەم شێوەیە تــاوانەکە دادەپۆشری. لەبەر ئەوە محمــد چەکــی خۆی تەسلیمکرد و فەرمانی دا بەمەفرەزە هەموو چەک تەسلیم کەن.

دیارە سەرچاوەی بڕیار بۆ بازگەی کۆیە لە مەعسکر سلام نزیک سلێمانی بـوو. پاش تەسـلیمکردنی چەکەکانیـان هەردوازدە کەسەکە، بەهەر دوو تەرمی شەهیدەکانیشەوە، گوازرانەوە بۆ معسکر سلام. لەوێ بەبــێ هــیچ لێکــۆڵینەوە، بە بــێ ناراســتەی هــیچ تــۆمەتێ. ١٠ کەسەکەی دیکەش کوژران بە پێی ( یاسای دارستان ) و هەر ١٢ یـان فڕێدرانە ناو چاڵێ بە کۆمەڵ. ناوەکانیان : ١ ـ محمد حمەدمین حلاق ٢ـ دارا ڕەشید ٣ـ شێرزاد موراد ٤ـ پێشڕەو کەریم ٥ـ سەرهەد کەریم ٦ـ خەسرەو ستار ٧ـ کاوە احمد ٨ـ خالید صالح ٩ ـ مصدق کریم ١٠ ـ سەفین حەمەدەمین ١١ ـ فارس حسن ١٢ ـ ژینۆ سەربەست. شایانی باسـە کە ژینـۆ پێشمەرگە نەبوو، خەڵکـی سـلێمانی بـوو لە زانکـۆی سەلاحەدین دەیخوێند. سوار بوو لەگەڵ ئەوان هەتا پارەی کرێ ڕێگەی بۆ بمێنێتەوە.

لە ئەنجامی خوێندنەوەی ئەم دوو ڕوداوەدا چەند پرسیاری دیتە کایە :

ـ ئاشکرایە کە ئامانج لەم کوشتنە تەنها کوشـتنی کە سایەتی محمد حلاق بوو وەکو کادرێکی حیزبی و کەسایەتیەکی سیاسی تێکۆشەر. ئەی بۆ چی یازدە کەسەکەیتر کوژران و گوناهیان چیبوو؟

ـ ئەگەر بکوژەکـان موسـوڵمانن کـام شـەرعی ئیـسلامی ڕێگەیـان پێدەدات ئەوخەڵکە بکـوژن بەوشێوە دڕندانە؟ ئەگەر مرۆڤایەتی دەناسـن کـام یاساو کـام مرۆڤایەتی ڕێگەیـان پێدەدات ١٢ هـاوولاتی بەو شـیوە داعشیانە، بکوژن بەبێ لێکۆڵینەوەو دادگا؟ پرسـیارێکی کۆتـایی : ئەم

تـاوانە چ جیـاوازیەکی هەیە لە تاوانەکـانی چەتەو پیـاو کوژەکـانی ڕژێمی سەدام یان چەتەکانی داعش؟

- پرسیارێکی تر ئاراستەی هەمـوو کوردێکی خاوەن عەقڵ و ویـژدان دەکەم: تۆ چ دڵێکـت خۆشـە بەو حوکمڕانە کوردیەی کە بەم شێوازە حوکمڕانی دەکەن؟ هەر بێگـانەیەک حکـومڕان بێت و پابەندی یاسـا و مافی مرۆڤ بێت باشترنیە لەو حوکمڕانە کوردە کە مێژوویەکی پڕ لە زوڵم و زۆر و گەندەڵکاری و خوێنڕشتنی بەدواوەبێ؟

- پێشنیاز بۆنەوەکانی ئایندە:

١ ـ سازکردنی دادگاییەکی عادلانە بۆ تاوانی کوشتنی محمد حلاق و مەفـــرەزەکەی، هەمـــوو تـــاوانێکی دیـــکەی لەم چە شـــنە کە حکومڕانـانی کـورد کردویـانە، بـام تاوانبـاران لە ژیانیـشدا نە مـابن، تۆمارکردنی ئەنجامەکان لە تۆمارگەی مێژوویاندا.

٢ ـ دانانی پەیـکەرێ بۆ عایـشە گوڵ و محمد حلاق کە هەویەی ڕاســـتەقینەی ئەو شـــارە تێکۆشـــەرەبوون لە قۆنـــاغی خۆیانـــدا، لە گۆڕەپانێکی سەرەکی شارەکە.

**٨-قەسابخانەیەك لە پێشمەرگەکانی پەکەکە:**

لە ناوەڕاستی نەوەدەکانا، پارتی لە ناو هەولێر پەلامـاری پ ک ک ی داو، نزیکەی ١٠٠ کادرو پێشمەرگەی بردن و بێ سەروشوێنی کردن. تا ئێستا گۆڕ و هەواڵیان ونە.

**٩-قەسابخانەی کۆمۆنیستی کرێکاری:**

لەسـاڵی ٢٠٠٠ دا میلیـشیای چەکدار لەنـاو شـارەکاندا زۆر بـوون، هاوڵاتیانیان پەستکردبوو. خەڵکی شاری سلێمانی داوای گواستنەوەی بارەگـا چەکدارە کانیـان دەکـرد بـۆ دەرەوەی شـار. هەمـوو حیزبەکـان و بەرپرسـانی جۆراو جۆر میلیـشایان لەنـاو شـاردا هەبـوو، بەڵام کێشەکە

تەنها بەسەر حیزبی کۆمۆنیستی کریکاریدا شکایەوە. ئەم حیزبە بارەگایەکی هەبوو لە گەرەکی گردی علی ناجی بە ڕێکەوت نزیک بوو لە ماڵی نەوشیروان مستەفا.ڕەنگە ئەوەش هۆکارێ بووبێ بۆ توند کردنی گوشار لەسەر ئەوکۆمۆنیستانە کە ئەو گەرەکە جێبهێڵن.

جەلال تاڵەبانی بەسەفەر چووە دەرەوەی وڵات و نەوشیروانی لە جێی خۆی دانا. نەوشیروان توندی کرد لەگەڵ کۆمۆنیستەکان و ئەوانیش خۆیان توندڕەوون. ئابڵوقە دران و ئاوو کارەباو تەلەفونیان لێبڕدرا، ڕادیۆکەیان کە لە ئەسڵدا یەکیەتی خۆی دابووی پێیان داخرا. دوای ئەمانەش کار لەکار ترازا، تەق و تۆق دەستی پێکرد و کران بە ئامانجی تەقەکەرانی ئاسایش کە بە فەرمانی نەوشیروان لە ١٤ / ٧ / ٢٠٠٠ دا تەقەیانکرد. پێنج کەس لە کۆمۆنیستەکان کوژران . هاوڕێ لەتیف، هاوار محمد، عبدالباست موحسین، ئومێد نگین، محمد مستەفا. یەکەسیش لە ئاسایش کوژرا. بریندارێش لە هەردولا هەبوو. ڕێگەش لە کۆمۆنیستەکان گیرا کە بە شێوەیەکی ئاسایی، بە پێی داب و نەریتی کۆمەلایەتی، تەرمی کوژراوەکانیان بە خاک بسپێرن و پرسەیان بۆ دانێن.

هەموو حیزب و ڕێکخراوە سیاسیەکانی هەرێم بێ دەنگ وەستان بەرانبەر بەم قەسابخانەیە جگە لە بزووتنەوەی دیموکراسیخوازان کە من بەرپرسی یەکەمی بووم. ئێمە بەیانێکمان دەرکرد کە لە خوارەوە دەقەکەی ( بڵاو دەکرێتەوە ) یەکەم کاردانەوەی نەوشیروان ئەوەبوو کە ئەو برە پارەیەی مانگانە لە یەکیەتیمان وەردەگرت وەکو ئەندامێکی هاوپەیمانی دیموکراتی، کە لە پێنج لایەن پێکهاتبوو پاش ٣١ ئابی ٩٦٦، لێمان بڕدرا. منیش داوای کۆبونەوەیەکم کرد لەگەڵ مەکتەبی سیاسی یەکیەتی. ڕازی بوون و دانیشتم لەگەڵ ملازم عومر عبدولا.

کورتەی قسە :

- بۆچی ئەو مانگانە کەمەتان لێبڕین؟
- ئێوە دژی یەکیەتین. چۆن پارەبدەین بە لایەنێ کە لە دژمان بێ؟
- بەرنامەی ئەو هاوپەیمانیە پێنج قۆڵیە کە ئێوەش واژۆتان کردووە ئەو مافەمان دەداتێ کە بوەستین دژی ئەو هەڵوێستە هەڵەیەتان.
- بەیانەکەتان بکشێننەوە پارەکەتان بۆ ئیعادە دەکەینەوە.
- زیاد لە پارە بڕینیش ١٥ ساڵ سجنم بکەن ئەو بەیانە ناکشێنمەوە.
شایانی باسە لەو کاتانەدا د. بەرهەم سەرەکوەزیرانی ئیدارەی یەکیەتی بوو بەڵام پێناچێ کەس پرسی پێکردبێ یان ڕۆڵێکی هەبوو بێ.
١٠- قەسابخانەی شەهیدانی وشەی ئازاد
١- سۆرانی مامە حەمە. پەیامنێری لڤین کە ڕۆژی ٢١ / ٧ / ٢٠٠٨ لە کەرکوک شەهیدکرا. ٢- زەردەشت عوسمان کە لە ٤ / ٥ / ٢٠١٠ لە هەولێر فڕێندرا و بە کوژراوی دۆزرایەوە.
٣- کاوە گەرمیانی ٥ / ١٢ / ٢٠١٣ سەعات ٩ی شەو بە بەرچاوی دایکیەوە کوژرا.
٤- وەدات حسین کە لە / ٨ / ٢٠١٦ لە ناوشاری دهۆک فڕێندرا، دوایی بە کوژراوی دۆزرایەوە.
٥- شکری زەینەدین ڕێکانی کامێرامانی تەلەفزیۆنی کەی ئێن ئێن لە ١ / ١٢ / ٢٠١٦ دا لە نزیک گوندەکەی خۆی ( بانە سەر - شیلادزێ - ئامێدی ) تەرمەکەی دۆزرایەوە.
ئەمانە شەهیدی وشەن. تەنها لەسەر ئەوە کوژراون کە شتیکیان نووسیوە بە دڵی سەرانی پارتی و یەکێتی نەبوە. هیچ بکوژێکیش نەدۆزرایەوە و قەت نادۆزرێتەوە چونکە لێکۆڵینەوە لە دەستی خودی بکوژەکانـدایە. بەڵام ئەمەش وەها نامێنێ، ڕەوڕەوەی مێژوو بەکەس ناوەستێنرێ.

# بەسەرهاتی جمیل محو

جمیل محو سکرتێری حیزبی دیموکراتی کوردی لوبنان لە ساڵی ٩٧١ هات بۆ کوردستانی عێراق، بە هیوابوو پێشوازی گەرمی لێبکرێ ویارمەتی بدرێ و دوایی بە ناستێکی سیاسی ـ رۆشنبیری پڕ لە ئەزموونی جەباتگێڕی و بە ورەیەکی بەرزترەوە بگەڕێتەوە بۆ لوبنان. بەڵام خەونەکەی نەهاتە دی. ئەم دامـاوە بێ ئەوەی هیچ تاوانێ یان هەڵەیەکی کردبێ، بێ ئەوەی هیچ لێکۆڵینەوەیەکی لەگەڵ بکرێ، خزێنرایە نێو بەندینخانەی خەلان و چوار ساڵی ڕەبەقی بەسەربرد، لە پاش ئاش بەتاڵی بەهاری ٩٧٥ یش کە مەلا مستەفا رایکرد و بۆماوەیەک لە شارۆچکەی ( نەغەدە ) مایەوە ئەم حەپسە داماوەی لەگەڵ کاروانەکەی برد و لەوێ پاش چەند ڕۆژێ بانگی کرد، بۆ ئەوەنا کە چوار ساڵ بە ناهەق بەندی کردووە و دەبێ داوای لێبوردنی لێبکات، بۆ ئەوەش نا کە باسی ئەو تێشکانە گەورەیەی بزووتنەوەی کوردی لەگەڵ بکات. بەڵکو بۆ شتێ کە سروشتی عەشرەتگەری و دواکەوتوویی خودی سەرکردەی کورد نیشاندەدات !، داوای لە جەمیل محو کرد کە عوبەیدیللای کوڕە گەورەی خۆی بۆ بکوژێ. هەرچەندیش پارەی بوێ بەرانبەر ئەم کوشتنە وەریدەگرێ !! ـ لاپەرە ٢٥٣ لە بیرەوەریەکانی جمیل محو بخوێنەرەوە کە بە عەرەبی لە ٩٨٢ دا چاپی کردووە بە ئەدرەسی ( مذکراتی داخل سجون الثورة الکردیة).

تێبینی : سەرچاوەی ئەم زانیاریانە کە لەسەر قەسابخانەکان نووسراوە وتارێکی کاک محمود ڕەزایە کە لەساڵی ٢٠١٦ دا بڵاوی کردۆتەوە.

## ڕیفراندۆمی کارەسات !

لەورۆژەوەکە مەسعود بەرزانی پرسی ریفراندۆمی ڕاگەیاند لە هەرێمدا گەلێ کەس هەستیان بەوەکرد مەترسیەکی گەورە ڕوودەکاتە هەرێم. من لەو ڕۆژانەی پێش ٢٥ / ٩ / ٢٠١٧ چەندین وتارم بڵاوکردەوە کە لە خوارەوە زۆربەیان دەخەمە ڕوو کەپێش ڕیفراندۆمەکە نووسیمە و پێشبینیم کردووە.

## ئایا کاتێکی گونجاوە بۆ ڕیفراندۆم ؟

بەگوێرەی ڕاپۆرتی بڵاوکراوە لە رێخراوی جیۆسیاسی (ستراتفۆر) ئەمریکیەوە بەرزانی لەم رۆژانەدا بە چڕی سەرگەرمی کەیسی ریفراندۆمی هەرێمە بۆ مەبەستی سەربەخۆیی هەرێم نیە، بەڵکو بۆ ئەوەیە کێشە جدی و ئاڵۆزەکان لە بیری ئەم خەڵکە بباتەوە. جگە لەمەش سەرانی دەسەڵات پرسی ریفراندۆمیان بەستووە بە کەیسی نیشتیمانپەروەری و دڵسۆزی بۆ گەل. خۆیان کردۆتە حەکەم و هەرکەسێ گوێڕایەڵیان نەبێ بە خاینی کوردی ناودەبەن. چاوی خۆیان لەو ڕاستیە دەنووقێنن کە مێژووی ئەم ٢٦ ساڵەی ڕابردوو، واتە مێژووی شەڕی نەگریسی براکوژی کە خۆیانی لێ بەرپرسیارن + پرسی گەندەڵکاری پڕ لەشەرمەزاری + تاریککردنی فایلی نەوتی هەرێم تا ئەم چرکەیەش + نەدانی مووچە و وەستاندنی هەموو پرۆژەکانی هەرێم و دارمانی وەزعی ئابوری و تێکدانی بازاڕ و...... هتد، لە هەمووشی خراپتر سەپاندنی شێوازێ لە دکتاتۆریەت، بە تایبەتی لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی بارزانی... هتد – ئەوەیە فایلی ڕاستەقینەی ئەوانە کە خۆیان دەکەن بە حەکەم و خەلکیدی دەکەنە خاین !

ئەگەر ریفراندۆمی ڕاستەقینە یان بویستایە دەبوو :

- ئێستە رژێمیکی دیموکراتی راستەقینە لە هەرێما هەبوایە نەک سەرۆکێکی ٢٦ ساڵە لەسەر کورسی و دوساڵە بە زۆرە ملێ سەپێنراو، دەبوو پەرلەمانی هەرێم سەرپەرشتی کاروباری ریفراندۆمی بکردایە نەک بەفەرمانی سەرۆکی نایاسایی. وا نزیکەی دووساڵە پەرلەمانیش پەکخراوە و چوونە ناو هەولێر لەسەرۆکەکەی قەدەغەکراوە. لەوڵاتی دیموکراتیدا ریفراندۆم پرۆسەیەکی دیموکراتیە و هەموو کەس ئازادە دیعایە بۆ چ کەیسێ دەکات و دەنگ بۆ جیابوونەوە یان پێکەوەژیان دەدات، وەک بینیمان لە ریفراندۆمی سلۆڤاکیا ( کە جیابوونەوە لە چیک ) و لەهەرێمی کویبک لەکەنەدا و سکۆتلەندا لە بەریتانیا کە زۆرینەی جیابوونەوەیان ڕەتکردەوە، کەس کەسی دیکەی بە خائین ناونەبرد و هیچ هەرا و کێشەیەکیش لەئەنجامدا نەقەوما.

-ئەوی پرسەکە ئاڵۆزتر ئەکات ئەوەیە کە رژێمی دیموکراتی لە عێراقیشدا نیە — راستە حیدەر عەبادی بەراورد ناکرێ بە نوری مالیکی، بەڵام رژیمی بەغدا بە گشتی هەر رژێمێکی تائیەفیە و ئەگەر کەسێ بیەوێ ڕێڕەوێکی ناتایەفی بگرێ زۆرینەی دژی دەوەستن.

-کاتی گونجاو بۆ ریفراندۆم ئەوەیە کە ناوماڵی کورد لە باشترین تەبایی و ڕێکوپێکییدا بێت، بەڵام هیچ کاتێك ناوماڵی کورد بەقەدەر ئەم کاتە شپرزە و شێواو نەبووە، پڕ لەکێشە و ناکۆکی و ململانێ نەبووە. سەرانی پارتی و یەکێتی ئەمە دەزانن و دەشزانن کە خۆیان دروستیان کردووە. بەڵام گوێنادەنێ چونکە بەهیوان ئەم ڕیفراندۆمە شانسی حکومڕانیان بۆ ٢٦ساڵی دیکە بۆ درێژبکاتەوە.

-ئاشکرایە کە بەغدا و تورکیا و ئێران و ئەمریکا و ئەوروپا، هەموو وتیان ( نەخێر بۆ جیابوونەوەی هەرێم لە عێراق ). باشە جەنابی

سەرۆک تۆ قسەی ئەوانە ڕەتدەکەیتەوە پشتبەچی دەبەستیت؟ ناترسیت هێندێ لەوانە سبەینێ پەنا بە هێزی سەربازی ببەن و هەموو دەستکەوتە مێژوویەکانی خەبات و قوربانی دەیەها ساڵی ڕابردووی ئەم میللەتە دارمێنێ؟ ئایا ئەمە کارەساتێکی گەورە و ترسناک نابێ؟

-١٠ – ١٥ ساڵ تێپەڕی بەسەر دەرچوونی دەستوور بە مادە ( ١٤٠ ) وە کە نەخشەی تێدابوو بۆ یەکلاییکردنەوەی پرسی ناوچەکێشە لەسەرەکانیش، کە پرسێکی زۆر ئاڵۆز و سەختە، بەستان بە کێشەی ریفراندۆمی گشتیەوە. ئابەمەش پرسی ریفراندۆم زۆر زۆر ئاڵۆزترکرا و چارەسەریشی زۆر ئاڵۆزترکرا. هۆکاری ئەمەش تەنها بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بەرژەوەندی گشتی گەل و نیشتمانتان کرد بە قوربانی بەرژەوەندی تەسکی حیزبایەتی خۆتان. ئێستەش ئەم میللەتە ستەمدیدەیە باجی هەڵەکانی ئێوە دەدات.

-وێڕای هەموو ئەمانەش هەڵاتنی چەکدارانی پارتی لە شنگال و دەوروبەری و چۆڵکردنی ئەو ناوچەیە بۆ تیرۆرستانی داعش لە ٢٠١٤ دا ئاڵۆزیەکی زیاتری خستە سەرکێشەی ناوچەکێشە لەسەرەکان و کاردانەوەیەکی توندی هەبوو لە نێوان لاوانی کوردی یەزیدیدا لەگەڵ پارتی و دواتر بوو بەهۆی پێکدادانی خوێناوی لە نێوان پارتی و یەکەکەدا وتا ئێستەش کێشەکە ماوەتەوە و ئەگەری تەقینەوەی ماوە. دەبوو سەرکردایەتی پارتی داوای لێبووردنی لە یەزیدیەکان بکردایە لەسەر ئەو کارەساتە کە توشی بوون. بەڵام بەداخەوە ئەوەشی نەکرد.

لەو ڕۆژەوە ڕژێمی سەدام حسێن ڕوخێنراوە لە عێراق – بەهەرێمیشەوە – پێویستیەکی زۆری بە پشوو و پرۆژەی دیموکراتیزە و ئاوەدانکردنەوە هەبوو. بەڵام سیاسەتی نوری مالیکی کە بەڕێوەبەرێکی تایەفی توندا بەڕێوەبراو بوو بەهۆی داگیرکردنی مووسڵ و ئەنبار و سەلاحەدین... هتد. لەلایەن تیرۆرستانی داعشەوە، بوو بەکۆسپ لە ڕێگەی هەموو

چاكسازیەكاندا. ئەولەویەت درا بە پرسی دەركردنی داعش. ئێستە كە داعش لەسەرەمەرگیدایە، دەپرسرێ : ئەمڕۆ كاتی ئەم ریفراندۆمەیە؟ ئایا مەترسی نیە پیلانێكی نوێ بێتە ئارا بۆ ئەوە ئاژاوە و پێكدادان هەر بەردەوام بێ؟

ئەگەر حەیدەر عەبادی وەك سیاسیەكی لێزان و ئەزموندار بجووڵێ دەبێ دانبەمافی ڕەوای كوردا بنێ لە جیابوونەوە و سەربەخۆیی، داوا لە گەلی هەرێم بكات كە پرسی ریفراندۆم دوابخات بۆ كاتێكی لەبارو كێشەكە بە لێكگەیشتن لە نێوان پەرلەمان و حكومەتی بەغدا و هەرێمدا ببرێ بەڕێوە.

بەهادین نوری

٢٠١٧/٧/١٠

# پرسیارێ بۆ سەرانی
# پارتی و یەکێتی دەربارەی ریفراندۆم

١-ئایا لە وڵاتێکدا کەپەرلەمانی تێدا هەڵبژێردراوە و ماوەی یاساییشی تەواو نەبووە، بەڵکو بە بڕیارێکی شەخسی نایاسایی لەکارخراوە، ئێوە وەک نوێنەری هەردوو حیزبی دەسەڵاتدار بە چ یاسایەک مافی ئەوەتان هەیە لەباتی پەرلەمانی شەرعی هەرێم بڕیار لەسەر جێبەجێکردنی ریفراندۆمی گشتی بدەن؟ یان هەر موزایەدە و هەوڵی درێژکردنەوەی ماوەی حکومڕانیتانە بۆ زیاتر لە ٢٦ ساڵی تر؟

٢-ئێوەش، ئەی نوێنەرانی حیزبەکانی دیکە، ناشرین نیە خۆتان بکەنە پاشکۆی حکومڕانان کە هیچ دەسەڵاتێکتان نیە جگە لە سەلماندنی ئەو شتەی ئەوان دەیانەوێ، پاش ئەوەی هەرێمیان گەیاندە ئەم قەیرانە توندە هەمەلایەنە؟

بەهادین نوری

٢٠١٧/٨/٦

# ئەركی ئەوانەی ریفراندۆمی ئەمڕۆی هەرێم بەهەڵە دەزانن دەبێ یەكبگرن

زۆرن ئەو كەسانەی كە دۆخی ئەم سەردەمەی هەرێم بە ناگونجاو دەبینن بۆ ریفراندۆم، ئەگەر پرسەكە بە شێوەیەكی لۆژیكی بخرێتە ڕوو دەبێ سەرجەم ئەوانە بێ دواكەوتن پێوەندی لەگەڵ یەكدی بكەن و باس لە هاوكاری و رێكخستنی چالاكی خۆیان بكەن بۆ ئەوەی هێزێكی كاریگەرتر كۆبكەنەوە و فەشەل بەو پرۆژەیە بێنن كە زیانمەندی دەبینن بۆ ئەم قۆناخەی میللەتی خۆیان. بەڵام مەخابن هێندێ لەم برادەرانەی هەرێم بەپێچەوانە دەجووڵێن، لەباتی هاوخەباتی پتەو، لەیەكتر دەخوڕێنن و بەسەر و گوێلاكی یەكتریدا دێن.

وانابێ برادەرینە. هیچمان نەكردووە تا بكەوینە ململانێی تەسكی حیزبایەتی و دەبێ سەرگەرمی كۆكردنەوەی هێزەكانی ئۆپۆزسیۆن بن. تا ئێستە چوار هێزی گەورە لەم هەرێمەدا ڕاوبۆچوونی خۆیان دەربریوە لە دژی ئەم ریفراندۆمە ناوەختە. گۆڕان كە دووەم حیزب دەرچووە لە دوایین پەرلەمانی هەرێمدا + كۆمەڵی ئیسلامی كە لەسەرەتاوە شان بەشانی گۆڕان وەستاوە + ١٢٢ رۆشنبیری هەرێم كە لەمامۆستایانی زانكۆ و رۆژنامەنووس و ئەدیب و رۆشنبیرانی دی پێكدێن و یاداشتێكیان پێشكەش بە حكومەت كرد و زۆر بەڕوونی و بەتوندی دژایەتی خۆیان راگەیاند + شاسوار عەبدولواحد كە خاوەنی دەزگایەكی ڕاگەیاندنی گرنگە و دۆست و دوژمنی حسابی جددی بۆدەكەن. ئەم چوار لایەنە یەك ڕاو و یەك ئامانجیان هەیە كەچی بەهەڵە و بێ پاساو خۆیان لیكدابڕیوە و ئەوی بەنەیارەكانیان ناكرێ خۆیان بەخۆیانی دەكەن ! هیچ گومانێك لەوەدانیە كە ئەگەر ئێوە ببنە بەرەیەك زۆرتان پێدەكرێ، خزمەتی زێتری گەل و نیشتمانتان پێدەكرێ، بەتایبەتی لەبەرئەوە كەبرایانی بەرانبەرتان پرۆژەیەكی هەڵەیان خستۆتە ڕوو لەبارودۆخی ئێستادا. ئێوە سەركەوتوو دەبن ئەگەر لەسەر ڕێرەوێكی راست و ڕەوان برۆن.

بەهادین نوری ٢٠١٧/٨/٦

# ڕیفراندۆم لەبەر ڕووناکی شیکردنەوەیەکی زانستی

من دەزانم کە خەڵکی ناهۆشیارو دواکەوتووی هەرێم بەجوێنباران و سوکایەتیپێکردن و ناوبردن بە ( جاش و خاین ) وەڵامی ئەو کەسانە دەدەنەوە، بێ ئەوەی بەرپرسانی حیزبی لۆمەیان بکەن لەسەر ئەو بێنە زاکەتیە یان و وشەیەک بڵاوبکەنەوە، بڵێن لە وڵاتانی دیکەش ریفراندۆم کراوە، بەڵێ و نەخێر وەکو یەک کاتی ڕاگەیاندن و لیست دابەزاندنیان هەبوو. لە کویبک و سکۆتلەندا زۆرینە دژی جیابوونەوە بوون، لێرە تەنها برادەرێکی سەرکردایەتی یەکگرتوو بەناوی خۆیەوە وتی. بوونی لیستی بەرانبەر دیاردەیەکی تەندروستە.

حەتمەن ئەو ڕۆژە دێت کەئەم میللەتە بگات بەمافی ڕەوای خۆی لەسەربەخۆییدا، بەڵام ئەوە : ١- کەی دەبێ؟ ٢- چۆن دەبێ؟ ئەوە وەرچەرخانێکی مێژوویی دەبێ لەژیانی ئەم میللەتەدا. بەڵام ئەم جۆرە وەرچەرخانە کاتێ دێتەئارا کە بارودۆخی خۆییانە و بابەتیانەی ( الظروف الذاتیة و الموضوعیة ) پێبگات. جا ئەمڕۆ چی لەم دوو فاکتەرە پێگەیشتووە؟

-بارودۆخی ( فاکتەری ) خودی هەرێم تا بڵێیت نالەبارە : سەرۆکێکی نایاسایی لە لووتکەی هەرەمی دەسەڵاتدایە و نزیکەی دوساڵە بەزۆرە ملێ پەرلەمانی پەکخستووە و لەناوچەی دەسەڵاتیدا حوکمی پۆلیسی سەپاندووە و پەردەی کێشاوە بەسەر فایلی نەوت و بووجەی گشتی هەرێمدا و مووچەی فەرمانبەرانی بڕیوە و نەوپەڕی نارەزایەتی خستۆتە ناو خەڵکەوە و ڕۆژێ لەڕۆژان، تەنانەت لەسەردەمی سەدامیشدا لاوانی هەرێم هەوڵی دەربازبوونیان لەنیشتمانەکەیان نەداوە وەکو ئەمڕۆ لەشوێن بەدەستهێنانی پەنابەرێتی. ئەم هەرێمە ڕۆژێ

لەرۆژان پەرت و بڵاوتر نەبووە وەکوئێستە ! حکومەتێ خەمخۆری گەل و نیشتمان بێ دەبێ هەولی چارەسەری ئەم کێشانە بدات لەباتی ریفراندۆمێ کەکێشەکان زێترکات و دۆخەکە ئالۆزترکات.

-بارودۆخی بابەتیانەش ئەوەیە کەهەرێم ئەمرۆ یارمەتیدەرێکیشی نیە بۆ سەربەخۆیی. لە عێراقیشدا رژێمێکی دیموکراتی نیە تاکارئاسانی بۆ هەرێم بکات. ئێران و تورکیا ئامادەن بەهێزی سەربازیانە سەرکوتی هەرێم بکەن تەنانەت بێ داواکردنی بەغدادیش !

کوردی عێراق ٣٠ ساڵ چەکی هەڵگرت بۆ ئۆتۆنۆمی، سەدان هەزار کەس کوژران. کۆتایی کیمیاباران و ئەنفالی سەدام بوو. ئەگەر سەدام کویتی نەگرتبایە، دوای ئەوە بەچەند ساڵێ هاوپەیمانی نێودەوڵەتی لاوازی نەکردایە و دواتر نەیڕوخاندایە ئێستەش ئەم کوردستانە لەو ئەهامەتیە ڕزگاری نەبوو بوو.

دەبێ هەموومان لەوە بگەین کەبەدەستهێنانی سەربەخۆیی هەرێم بە رێگەیەکی ئاشتیانەی دیموکراتیدا دەڕوات. ئەمەش تەنها لە عێراقێکی دیموکراتیدا بەلێکتێگەیشتن لەگەڵ بەغداد دەکرێ. ئێوەش برایانی ریفراندۆمخواز، ئەگەر ریفراندۆمی جیابوونەوەتان دەوێ ئەوە خۆتان دەزانن کەبۆتان ناکرێ لەم دۆخەدا، ئەگەر پرسەکەش بۆ موزایەدە و خەڵەتاندنی ئەو خەڵکەیە ئەوە حسابتان هەڵەیە و ڕەنگە لەسەر خۆیشتان گران بکەوێ.

بەهادین نوری

٢٠١٧/٨/٩

# پەیامێ بۆ سەرۆکی هەرێم
# یان بەدیلێ بۆ ڕیفراندۆم

بەڕێز کاک مسعود!

لە دانیشتنەکەتاندا لەگەڵ زانایانی ئاینی هەرێم ئەو پرسەتان ئاراستەکرد کە ئەگەر ڕیفراندۆم دوابخەن بەدیل چیە؟ من وەڵامی ئەم پرسیارەتان دەدەمەوە و بەدیلتان دەخەمە بەردەم بە شێوەیەکی لۆژیکی :

بێگومان سەربەخۆیی کورد مافێکی ڕەوای هەرێمە، بەتایبەتی لە دوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە کە دەوڵەتە ئیمپریالییە بەهێزەکان خەریتەی سیاسی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستیان داڕشتەوە. بەڵام ئەوەنەکرا، بارودۆخی جیۆپۆلیتیکی – دابەشکردنی کوردستان بەسەر چوار دەوڵەتی ناوچەکەدا – پرسی کوردی زۆر ئاڵۆزکرد و کۆسپی گەورەی خستە بەردەمی.

بۆ دەیەها ساڵ کوردی عێراق بە خەبات و قوربانی بێشومار کەوتە جەنگ بۆ مافی نەتەوەیی ڕەوای خۆی و لەئەنجامدا، لەم جیهانە ناعادلە، توشی شکستی سەختهات و بەکیمیاباران و ئەنفال سەرکوت کرا. بەڵام لەئەنجامی جەنگی کەنداودا و بەیارمەتی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی دۆخێکی وەهای بۆ هاتە پێش کە جارێکی دیکە هەڵسێتەوە و کۆمەڵێ دەستکەوتی گرنگی بەدەستهێنا لە گیانێکی نیمچە سەربەخۆدا بۆ ماوەی ١٢ ساڵ بەر لە ڕووخانی سەدام، ئەوە هەلێکی زێڕین بوو تا هەرێم پێگەی سیاسی و ئابوری و سەربازی خۆی بەهێزبکات بۆ ڕۆژگاری پاش روخانی سەدام، بەڵام بەداخەوە سەرانی پارتی و یەکێتی کەجلەوی دەسەڵاتیان گرتبووە دەست بەرژەوەندی تەسکی حیزبایەتیان خستە سەرووی هەمووشت و جارێکیتر شەڕی براکوژیان هەڵگیرساند لەنەوەدەکاندا و هەرێمیان کردە دوو دەوڵەتۆکە و

دوو ناوچە و دوو ئابوری و دوو هێزی سەربازی حیزبی کەتا ئێستەش بەکردەوە ئەم وەزعە چارەسەرنەکراوە بەڵکو بەپێچەوانەوە، ژمارەیەکی زۆر کێشەی تری جورا و جۆری هاتۆتە پاڵ، کە دواییینییان پرسی ئەم ڕیفراندۆمە ناوەختەیە.

* * *

ئەمڕۆ دوورێگە هەیە بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی هەرێم :

١ -ڕێگەی خەباتی چەکداری دژ بەحکومەتی بەغدا. خۆشتان دەزانن ئەمە بژاردەیەکی گونجاونیە، دەڵێن " دەکەوینە وتوویژ پاش ڕیفراندۆمەکە ."

٢ -ریگەی ئاشتیانەی دیموکراتی شارستانی وەک لە چەند وڵاتیکی دیموکراتیدا ( سلۆڤاکیا، کەنەدا – کویبک، سکۆتلەندا ) ئەمڕۆ تاکە ڕیگەیە. پێڕەوی ئەم ڕیگەیەش مەرج و پێداویستی خۆی هەیە کە بەشێکی دەکەوێتە ئەستۆی حکومڕانانی هەرێم و بەشەکەیتری لەئەستۆی حکومەتی بەغدادایە. تائەم چرکەیەش هیچ کام لەم دولایەنە بەئەرکی خۆی هەڵنەساوە لەم بارەوە. پاش داڕشتنی دەستور بۆ ٨ ساڵ نوری مالکی حکومڕانبوو، وەک تایەفیەکی توندڕە و ڕێبازی شیعەگەری گرتەبەر دژی کورد و مووچەی لێبڕین و دژی سوننەی عەرەبیش خراپتر، سیاسەتێکی وەهای گرتەبەر کە بوو بەهۆی داگیرکردنی مووسل و تکریت و ئەنبار و شنگال و حویجە و گەلێ جێگەی تریش، ئەگەر پێشمەرگەی هەرێم فریانەکەوتنایە کەرکوکیش دەگیرا. ئێستەش مالکی شایستەی دادگایە لەسەر ئەو تاوانە و ئەو گەندەڵیە گەورانە. بەهەرحال بێ هاوپەیمانی شیعە مالیکیان لەسەر کورسیەکەی دابەزان، پاش هەشت ساڵ لە حوکمڕانی و، حەیدەر عەبادیان دانا کەلەوی پێشوو باشترە ئەگەر چی هەر لەچوارچێوەی رژێمێکی تایەفیدا حوکمدەکات. عەبادی رێزی

لەپەرلەمــان گرتــووە، گــورزێکی ســەربازی کوشــندەی ئاڕاســتەی تیرۆرستانی داعش کرد و هاوسەنگیەکی لە وەزعی ئابووری عێراقدا ڕاگــرت و ســەرەڕای وەرگرتنــی گەنجیــنەی خــالی لە مــالیکی و دابەزینی نرخی نەوت لە ٢٠١٤ دا.

ئێوەش، جەنـابی سـەرۆکی هەرێم، ئەوە ٢٦ ســاڵە لەسـەر کورسـین و هەمــوو پــوول و پــارەی هەرێم لەژێر دەســتاندابووە و ئەنجامەکەش ئەم هەرێمە وێرانە داماوەیە کە ساڵ لە دوای ساڵ خراپتربووە. پاش ئەم ٢٦ ساڵە ئەوە ٣ ساڵە مووچە نادەن بە کارمەندان و خانەنشینان، ئەوە حاڵی کارەباتــانە، نەتــانتوانی مــاڵ و بەرمیلێ لە زســتاندا دابەشبکەن، ئەوە پــرۆژەی ئــاوەدانکردنەوە ٣ ســاڵە لەجێــی خــۆی وەســتاوە یــان بەرەو دواگەڕاوەتەوە --- لەهەمــووی خراپتــر ئەوەیە پــرۆژەی دیمــوکراتیزەی وڵات بەرەودوا گەڕاوەتەوە. لەبەغدا، پاش روخانی سەدام بە ١٤ ساڵ، ٣ ساڵە عەبادی سەروکوەزیرانە پەرلەمـان هەیە و ڕۆڵێـک دەبینێ. بەڵام لەهەرێم، پـاش دوسـاڵ لە رووخـانی سـەدام و هەڵبژاردنـی پەرلەمـانی ١٩٩٢، ســەرانی پــارتی و یەکێتــی جەولەیەکــی نــوێ لەشــەڕی براکوژیتان هەڵگیرساند، لەباتی چارەسەری کێشەکە پەرلەمانی فیفتی – فیفتی تەجمیدکرا چونکە دیموکراسی لەهەرێمدا نەبوو. لەتشرینی ٢٠١٥ دا هەمــان ســیناریۆ دوپــاتکرایەوە، بەڵام ئەم جــارە بەئەمــری سەرۆک بەتەنیا، تەنانەت قەدەغەکرا لەسەر سەرۆکی پەرلەمان بچێتە نــاو پــایتەختی هەرێــم ! ئەمە دیــاردەیەکی ســەیرە کەهەرگیــز لە فەرهەنگی دیموکراسیدا نەبینراوە : مرۆڤێک هاوڵاتی بێت، سەرۆکی پەرلەمان بێت، حکومەت ڕێگەی چوونەناو پایتەختی وڵاتەکەی خۆی لێقەدەغەدەکات.

نەخێــر ڕاســت نــیە کەئەولەویەت بــدرێ بە دروشــمی ڕیفرانــدۆمی سەربەخۆیی هەرێم لە کاتێکدا کەئەم قەیرانە هەمەلایەنە دەستی ناوەتە

بینی هەرێم، کە هێشتا شەڕی عێراق دژ بە تیرۆرستانی داعش تەواو نەبوە، کەریفراندۆمی ناوچەدابڕاوەکان ( مادەی ١٤٠ لە دەستوور ) نەکراوە و حکومەتی هەرێم هەوڵی جدی بۆ نەداوە، کەهیچ هەنگاوێ بۆ چارەسەری کێشە گرگرتووەکان نەنراوە ( نەموچە، نەکارەبا،... هتد)، نەرێگە خۆشکردن لە عێراق و لە خودی هەرێمیشدا بۆ ریفراندۆمێکی ئاشتیانەی دیموکراتی ئازاد، وەکو لەدەوڵەتە دیموکراتیەکاندا دەکرێ، بۆسەربەخۆیی هەرێم لە دۆخی گونجاودا — نەک دروستکردنی باشور سودانێکی دیکە، پاش ٢-٣ ساڵ هاولاتیان ئاواتەخوازی وەزعی پێشوبن!

ئەوەیە بژاردەی سەرکەوتوو لەباتی ئەم ریفراندۆمە ناوەختە، جەنابی سەرۆک ! ئەگەر رێڕەوێکی ڕاست و دروست بگیرێ دەبێ پەرلەمانی هەرێم کارابکرێ و کێشەی سەرۆکایەتی هەموار بکرێ و پێداویستی جێبەجێکردنی هەڵبژاردنی پەرلەمانێکی نوێ دابین بکرێ چونکە ماوەی ئەم پەرلەمانە لە حوکمی تەواو بووندایە.

بەهادین نوری

٢٠١٧/٨/١٦

# هەموو شتێ بەڕاشکاوی

لە بارودۆخی جەنگی کەنداودا، پاش خەباتی سەختی خوێناوی درێژخایەن، هەرێمی کوردستان ئەم دەسکەوتە گەورانەی دەستکەوت کە ئێستە هەیەتی. ئەگەر سەرانی پارتی و یەکێتی لە نەوەدە کاندا هەرێمیان نەخزانایەتە ناو شەڕی برا کوژی و ئەو هەموو گەندەڵکاریە لەم ساڵانەی ڕابووردوودا نە بوایە بێگومان ئێستە زۆر باشتریش دەبوو، بەڵام بەهۆی سیاسەتی چەوتی نادیموکراسیانەوە وڵاتە کەمان گەیشتووەتە چەقی قەیرانێکی هەمەلایەنە، وردتر بڵێین خزێنراوەتە ناو تونێلێکی تاریک و ڕوو بە ڕووی مەترسی گەورە بۆتەوە کەهەموو دەسکەوتەکانی خستۆتە ژێر هەڕشە.

بڕیاربەدەستانی هەرێم بەوەوە نەوەستان کە ئەم قەیرانە هەمەلایەنە قووڵەیان خولقاند، بەڵکو بەهێنانی بەزمی ڕیفراندۆمێکی تەک لایەنەی ناوەخت بۆ جیابوونەوەی لە عێراق، لە کاتێکدا کە بەرزانی لە تشرینی ٢٠١٥ وە پەرلەمانی لە کارخستووە وسەرۆکی حیزبەکانی کۆکردۆتەوە بۆ تاوتوێی پرسی ریفراندۆم، کە تەحەدای دەسەڵاتدارانی ئەمریکاو ئەورووپا و ڕوسیا و بەغداد و ئەنقەرە و تاراندەکات. ئەمەش هەڵوێستێکی ئەوپەڕی نالۆژیکیە و بەرژەوەندی باڵای ئەم میللەتە دەخاتە بەرگەورەترین مەترسی. بەرپرسی یەکەمی ئەم هەڵە کوشندەیەش سەرۆکی هەرێمە کە بە بڕیاری شەخسی خۆی پەرلەمانی پەکخست و تەنانەت چونە ناو هەولێریشی لە سەرۆکی پەرلەمان و وەزیرەکانی گۆڕانی لە سلیمانی قەدەغەکرد. بە دەستپێشکەری خۆیشی بەزمی ڕیفراندۆمی هێنایە کایە. بەرپرسی دووەمیش سەرانی یەکێتی بوون، وردتربڵێین هێندێ کەسیان کە بەرژەوەندی گشتی گەلیان کرد بە قوربانی بەرژەوەندی تایبەتی شەخسی. ئەگەر یەکێتی بیویستایە ڕێگە

له سەرۆکی هەرێم بگرێ بۆ هەر هەنگاوێکی ناتەبا لەگەڵ بەرژەوەندی گەل ئەوەی بە ئاسانی بۆ دەکرا بە جێبەجیکردنی ئەو رێکەوتنامەی لەگەڵ گۆڕان مۆری کرد. بەڵام دیارە یەکێتی تەنها بۆ گوشارو ترساندنی بەرزانی تا زیادەڕەوی نەکات لە دابەشکردنی هەریسەکەدا، ئەگینا رێکەوتنەکەی جێ بەجێ دەکرد. زۆرینەی یەکێتی دژ بە هەموو جۆرێ پاشکۆ گەریە بەرانبەر پارتی. ئەمەش کیانی حیزبی یەکێتی رووبەڕووی چارەنوسێکی ترسناک کردۆتەوە، لە کاتێکدا کە هەموو نیشتمانپەروەرێکی دڵسۆز حەز بەوە دەکات یەکێتی ڕۆڵی خۆی ببینێ بە رێکوپێکی لە بزافی سیاسی کۆمەڵگەدا.

ئەوخەڵکە چاوەڕێبوون لە گۆڕان رۆڵکی کارامەتری هەبێ، پاش ئەوەی بە گورڕوتینێکی بە هێزەوە، بۆ یەکەم جار، ئۆپۆزسیونی پەرلەمانی دروستکرد بە بردنەوەی ٢٥ کورسی. بەڵام مەخابن بە بەشداری لەحکومەتی پارتی و یەکێتیدا کەیسەکەی گۆڕی دژ بە بەرژەوەندی خۆی.. هەڵوێستی لۆژیکی بۆ ئەو هەرمانەوە لە هێڵی ئۆپۆزسیوندابوو. کەچی ئەو پاش دەرکردنیشی لە پەرلەمان و حکومەت هەرمایەوە لە حکومەتدا. بەمەش زیانی زۆری لێکەوت. لە هەموو ریفراندۆمێکی دنیادا بوونی بەرەی بەڵێ و بەرەی نەخێر دیاردەیەکی سروشتی بووە، بەڵام لای ئێمە جیایە. راگەیاندنی پارتی بە تیرۆری هزری دەستی پێکردووە، ئەوی دژی سەربەخۆیی دەنگبدا خاینە و جاشە!

هەلێکی لەبار رێکەوت بۆ ئۆپۆزسیۆن کە بەرەیەکی چوار قۆڵی دروستبکەن بۆ خۆیان ( بزوتنەوەی گۆڕان + کۆمەلی ئیسلامی + ١٢٢ روشنبیری ناسراوی هەریم + بزوتنەوەی نەخیر لە ئیستادا ) دژی ریفراندۆم. بەڵام بەداخەوە لە کیسیاندا، هەموویان هەڵوێستی هەڵەیان بەرانبەر یەکتر وەرگرت. ئیستەش بەرژەوەندییان لەوەدایە کە پاشەکشە لەو هەڵەیە بکەن و بە رەیەک دروستبکەن، زۆر زۆر بە هێزتر ئەبن.

هیچ گومانی نیە کە لە ئەنجامدا بەرەی ( بەڵێ ) دۆڕاون. ڕەنگە بۆ ڕیش بچن و سمێڵیشی بنێنە بان. ئەوانەش کە دڵخۆشن بەکەمی ژمارەی ئامادە بوانی خەڵک لە یاریگای سلیمانی بە هەڵەدا چوون. ئامادە بووانی چەند هەزار کەسێ بۆ یەکەم کۆبوونەوەی ( نەخێر لە ئێستادا )، سەرەڕای ڕاگەیاندنێکی چڕوپڕ لەدژیان، بە زۆر دەژمێردرێ و لافاوی گەورەش لە دڵۆپێکی بارانەوە دەستپێدەکات.

من داوا لە سەرانی هەرێم دەکەم کە چۆن خۆیان ئەم بەزمەیان بێ پەرلەمان دروستکرد ئاوەها خۆیان هەڵیوەشێننەوە، پەرلەمانی پێ ناوێ، بکەونە کار بەشێوەیەکی یاسایی لەگەڵ بەغدا بۆ جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ لە دەستوور، بۆ ئەوەی ئەم میللەتە ستەمدیدەیە تووشی کێشەی زیاتریش نەکەن.

بەسە ٢٦ ساڵ حوکمڕانی فاشل بەم هەموو کێشەو قەیرانەوە کە خولقانتان ! ئەم میللەتە ستەمدیدەیە توشی ململانی خوێناوی مەکەن.

بەهادین نوری

٢٠١٧/٩/١٣

# ئەگەر ڕیفراندۆم کرا دواتر چی بەدوادا دێت ؟

دیاردەیەکی سروشتیە کە کوردانی هەرێم تانەوپەڕی دەرەجە دڵیان بە سەربەخۆیی و دروستبوونی دەوڵەتی خۆیان خۆشبێ. ئەمە مافێکی ڕەوای خۆیانە، دەیەها ساڵ خوێنیان لە پێناودا ڕشتووە. ئەم دەستکەوتانەی ئێستە لە هەرێمدا هەیە ئەنجامی ئەو قوربانی و خەباتە درێژخایەنەیە. هیچ گومانێکیش لەوەدا نیە کەلە کۆتاییدا کورد دەگات بەو سەربەخۆییە. بەڵام پرسیار ئەوەیە کەی و چۆن؟ ئەوە سەد ساڵە کورد لە هەوڵدایە و، لە ١٩٢٣ شێخ مەحمود حکومەتی کوردی لە سلێمانی دروستکرد و ١٩٤٦ قازی محەمەد لە مەهاباد حکومەتی کوردی ڕاگەیاند، بەڵام هیچیان نەمان. بۆچی نەمان؟ ئەمان چونکە ئیمپریالیزمی بەریتانی لە عیراق و ڕژێمی تاران لە ئێران ڕێگربوو، کوردیش ئەو هێزەی نەبوو بە زۆر مافی خۆی بسەپێنێ.

ڕێکەوتنێکی مێژوویی ناهەموار ترازووی هێزی بەبەرژەوەندی داگیرکەرانی کوردستان سازاندووە. ئەگەر هەزار ناکۆکی و کێشەش لەنێو ئەم چوار دەوڵەتە داگیرکەرانەدا بووبێ ئەمە ڕێی لێ نەگرتوون یەک هەڵوێستیان هەبێت بەرانبەر بەکورد لەکاتی پێویستدا وەکو پەیمانی سەعدئاباد نیشانی دەدا. ئێستەش ئەم حاڵەتە بەردەوامە وهەر بەردەوامیش دەبێت تا گۆڕانکاریەکی نوعی بەسەر وەزعەکەدا نەیەت یان بەپەیدابوونی ڕژێمی دیموکراتی لە هێندێ لەم چوار وڵاتەدا یان بەجێبەجێکردنی ئەو بەڵێنەی ئەمریکا داویەتی ( بەیانی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بخوێنەوە لێرەدا ).

ئەگەر بەدەستهێنانی سەربەخۆیی هێندە ئاسان بوایە وەک سەرۆک دەڵێ دەمێبوو ئەم وڵاتە سەربەخۆ بوو. بەڵام بەداخەوە وانیە. جەزائیر بەیەک ملیۆن شەهید گەیشتە سەربەخۆیی. کوردیش سەدان هەزار

شەهیدی داوە و هێشتا لەنیوەی ڕێگەدایە. منیش دەڵێم بەڵێ بۆ ڕیفراندۆم بەڵام دەمەوێ بەشێوەیەکی وەهابێ کە کێشە و مەترسی گەورە بۆ ئەم میللەتە دروستنەکات و نەبێ بە قوزەڵقورد، نەگاتە خوێنڕشتن و نەهامەتی.

جگە لەمانەش قسەی ئاگرینی پڕ لەحەماسی ئێستەی سەرۆک ئەزمونی تاڵی ئەم ٢٦ ساڵەی ڕابردوو لە حکومڕانی سەرانی پارتی و یەکێتی لە بیری خەڵک ناباتەوە. بۆنموونە ٧ – ٨ مانگە نرخی نەوت بەرزبۆتەوە بەڵام سیستمی پاشەکەوت وەک خۆی ماوە، کێشەی کارەبا هیچی لێنەگۆڕاوە، وەگەر خستنەوەی پەرلەمان هیچی لێنەڕواوە.... هتد.

من داوا لە سەرانی باڵای هەرێم دەکەم گوێ لە قسەی واشنتن بگرن و پاشگەزببنەوە لە ریفراندۆم. ئەمریکا خۆیشی بەرژەوەندی تایبەتی خۆی هەیە و لەگەل بەرژەوەندی گەلی ئێمە یەکدەگرێ و ئەوەش هەلێکی لەبارە بۆ کورد نابێ لەکیس بدرێ. رجایەکی گەرم ئاراستەی بڕیار بەدەستانی باڵای هەرێم دەکەم کە بەرژەوەندی باڵای گەل و نیشتمان بخەنە سەرووی بەرژەوەندی شەخسی و حیزبایەتی تەسک و گوێ لە دەنگی عەقل بگرن، ریفراندۆم دوابخەن. بەدیلی ئەمریکا قبوڵ بکەن.

بەهادین نوری

٢٠١٧/٩/٢٣

# دوای دەست لەکار کێشانەوەی سەرەکوەزیرانی هەرێم و جێگرەکەی

ئەو ڕیفراندۆمەی ٢٥ ئەیلوول کە حکومەتی هەرێم کردی، بەکارەساتێکی گەورەشکایەوە بەسەر ئەم میللەتەدا. ئەوە بوو سەرۆکی هەرێم بەرپرسیارێتی لەئەستۆگرتوو دەستی لەکار کێشایەوە. بەهەموو پێوەرێکی دیموکراتی و شارستانی وەکو سەرەکوەزیران و جێگرەکەی بەڕێزیشتان بەرپرسیارن لەو ئیشە و لەئەنجامەکانی. ئەمە سەرەڕای بەرپرسیارێتیتان لەو قەیرانە ئاڵۆزە هەمەلایەنەی کەپێش ریفراندۆم باڵی بەسەر هەرێمدا کێشابوو — وەکو کێشەی نەدانی مووچە، پەکخستنی پەرلەمانی هەرێم، دارمانی وەزعی ئابووری هەرێم و پشێوی ژیانی خەڵک، کێشەی کارەبا و سووتەمەنی پاش ٢٦ ساڵ لە حکومڕانیتان.... زۆر شتی تریش. لەبەر ئەوە پێویستە ئێوەش وەک سەرۆکی هەرێم بەرپرسیاری لەئەستۆ بگرن و دەستلەکاربکێشنەوە. لەبەر ئەوەی حیزبەکانی ئۆپۆزسیۆن ( گۆڕان و کۆمەڵ ) ناتوانن بەزۆرینەی دەنگی پەرلەمانی حکومەت دروستکەن پێویستە حکومەتێکی کاتی تەکنۆکراتی بێلایەن دروستبکرێ بۆ ماوەی ٦-٩ مانگ، بۆجێبەجێکردنی دوو ئەرک :

١-گفتوگۆ لەگەڵ بەغدا سەبارەت بەوکێشانەی لەئەنجامی ریفراندۆمدا بەرپابوو، بەتایبەتی جێبەجێکردنی ئیدارەی هاوبەش لەناوچە کێشە لەسەرەکان.

٢-سەرپەرشتی هەڵبژاردنێکی پەرلەمانی خاوێن نوێ و گێڕانەوە وەزعی ئاسایی لە هەرێمدا.

٣ -هەوڵی دابینکردنی مووچە بۆ مووچە خۆران.

بەهادین نوری- ٢٠١٧/١١/١٨

## ڕێگە چارەی کێشەی کورد

## کێشەی کورد چیە؟

کێشەکە ئەوەیە کە میللەتێکی چل ملیۆنی لەم جیهانە پێشکەوتووەی سەدەی ٢١ دا بێبەشکراوە لە مافی نەتەوەیی خۆی، لە بوونی دەوڵەتی خۆی وەکو میللەتانی دیکەی ڕۆژئاوای ناوەڕاست، وڵاتەکەی – کوردستان – دابەشکراوە بەسەر چوار دەوڵەتیتردا. بەڵێ دابەشکردنی کوردستان دەستکردی ئەمڕۆی عەرەب و تورک و فارس نیە. ئەمە جێماوەی بەسەرهاتی مێژووی دوور و درێژی ئەم ناوچەیەیە. بەڵام ئەم چوار دەوڵەتە ئەندامن لەUN داو ناشنان بە پەیماننامەکەی، دەبێ پابەندبن بەو پەیماننامەیەوە کەدانی بە مافی چارەنووسی هەموو میللەتێکی ئەم سەرزەمینەدا ناوە.

ئەمڕۆ نزیکەی ٢٠٠ دەوڵەتی سەربەخۆ هەن و ئەندامن لە UN دا. چەندین دەولتۆکەشیان تێدایە وەک بەحرەین کەبە مەساحە ٦٠٠ کم چوارگۆشەیەو بە ژمارەی دانیشتوانیش چەند سەد هەزارێ. باشە، بەحرەین و جیبوتی و کۆمەڵێ دەوڵەتی لەو چەشنە سەربەخۆییان پیرۆزبێ، بەڵام بۆچی مافی سەربەخۆیی نادرێ بە میللەتی کورد کەبە ژمارەی دانیشتوان سەد ئەوەندەی بەحرەینەو بە مەساحەش ٤٠٠ – ٥٠٠ ئەوەندە؟ من ئەم پرسیارە ئاراستەی سکرتێری گشتیUN و ئەندامانی ئەنجومەنی ئاسایش و سەرانی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدەکەم، چاوەڕوانی وەڵامیانم. ئەوقسەیە کە دەکرێ ( یەک پارچەیی ئەم وڵاتانەی کوردستانیان لە نێواندا بەشکراوە دەبێ پارێزراوبێ ) بە قسەیەکی ناڕەواو نالۆژیکی دەزانم، دوورە لە پرەنسیپی یاسای نێودەوڵەتی. کورد مافی ڕوای سەربەخۆیی خۆی دەوێ و بە زۆرە ملێ هێڵراوەتەوە لە نێوان ئەم چوار دەوڵەتەدا.

مــن نــامەوێڵێرەدا وەک نــوێنەرێکی هەرچوارپــارچەکەی کوردســتان قسەبکەم. بە بۆچوونی من مێژووی دووروودرێژی ڕابووردوو جیاوازی زۆر و گەورەی لەبارودۆخی ئەم چوار پارچەیەدا خولقاندووەو بە هیچ جۆرێ گونجاونیە یەک پرۆژەی سیاسی و یەک شێوە لە تەکتیکات دارێژی بۆ هەر چوار پارچەکە. نابێ چاو بنوقێنرێ لەو جیاوازیانەی کە هەیە. هەر لێرەشـەوە دلـێم: ( بەڵـێ بـۆ کۆبـوونەوەی هـاوبەش و ئـاڵوگۆڕی ڕاو ئەزموون و پێشکەشکردنی ڕخنەی برایانە و پێشنیازی دۆستانە لە نێوان نوێنەرانی پارچەکاندا.. بەڵام نابێ هیچ حیزبێ یان کەسایەتیەک ئەو مافە بدات بەخۆی کەوەک کوێخا و سەرکردەی بەرپرس دەست بخاتە کاروباری پارچەکانیتر. بەڵێ بۆ تەبایی و تەنسیق و هاوکاری ! نەخێر بۆ خۆسەپاندن و دەستێوەردان!

هێندێ پرەنسیپی بنەڕەتی بۆ چارەسەر، ئێمە لە سەردەمێکدا دەژین کە پێشکەوتنی زانست و تەکنیکی تێیدا گەیشتۆتە لوتکە، سەردەمی گلۆبال ( عولمە ) کە جیهانی تێدا بۆتە گوندێکی بچوک بۆ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی. لە جیهانی گلۆباڵدا هەموو مرۆڤایک دەتوانێ ڕاوبۆچوونی سیاسی خۆی بڵاو کاتەوە لە یەک چرکەداو ئەوەشی بیەوێ موناقەشەی بکات دەتوانێ فەورەن ڕای خۆی بڵاوکاتەوە لە ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنیدا. ئەگەر بیشتەوێ ڕاستەوخۆ، بەدەنگی زیندوو، لەگەڵ کەسێ، لەهەر وڵاتێکی ئەم سەرزەمینەدا هەبێ، قسەو ئاڵوگۆڕی ڕابکەی لەڕێگەی تەلەفۆنە بچکۆلەکەی گیرفانتەوە ئەوەت پێدەکرێ. ئەمە مانای وایە کە ژیانی کۆمەڵگەی ئادەمیزاد قابیلی پێشکەوتنە لە ماوەی ١٠ساڵی ئەم سەردەمدا زێتر لە پێشکەوتنی ١٠٠ ساڵی پێش گلۆباڵ یان هەزار ساڵی پێش شۆڕشی پیشە سازی.

لەگەڵ زیاد بوونی کاریگەری گلۆباڵ لە سەر ژیان و جموجوڵی کۆمەڵایەتی، لە ساڵانی داهاتوودا، کێشەی ئەو میللە تانەی کەتا ئەمڕۆ ژێردەستەن، وەکو کورد و بلووچ و ئەمازیخ و عەرەبی فەلەستین و...هتد، چارەسەردەکرێن لە ڕێگەی ئاشتیانە و دیموکراسیانەوە. گلۆباڵ جیهان بەرەو ئەشوو نمای دیموکراسی دەبات و هەموو پێشکەوتنێکی دیموکراسیش پێشکەوتنە بەرەو یەکسانی سەرجەم میللەتان و دوورخستنەوەی جیهان بەگشتی لە زەبرو زۆر و جەنگ و چەوساناوە.

* * *

دێمەوە سەر پرسی کورد لە عێراقدا. ئەم میللەتە دەیەها ساڵ ڕاپێچی شەڕی چەکداری کرا کەهیچ بەرژەوەندیەکی خۆی تێدا نەبوو، بەڵکو بە پێچەوانەوە. لە ١٩٦١دا ئامانجی ئیستعماری ئینگلۆ – ئەمریکی جێبەجێکرا کە ڕووخانی ڕژێمی قاسم بوو.کوردیش بە ئامرادی بەرانبەر ڕژێمێکی سەربازی فاشی مایەوە لە شەڕدا تا ١٩٨٨ کە سەدام ٤٠٠٠ گوندی ڕووخاندو ئەنفال و کیمیابارانی کردو دەستیگرت بەسەر هەموو گۆڕەپانی کوردستاندا. لە ئەنجامی شەڕی کەنداودا هەلێکی لەبار هاتەپێش بۆ کورد کەببووژێنەوە و دەستبگرێ بەسەر هەرسێ پارێزگاکەی هەرێمدا. ئەمە هەلێکی زێرینی خستە بەردەم پارتی و یەکێتی بۆ بنیاتنان و خۆبەهێزکردنی هەرێم بەڵام کردیان بەهەلێ بۆ شەڕی براکوژی لە ماوەی چوار ساڵدا تا تورکیا بەشداری ڕاستەوخۆی کردو یەکێتی ناچارکرد بە وەستانی شەڕ.
مادەی ( ١٤٠ ) لەدەستوری عێراقدا چارەسەرێکی باشی دانابوو بۆ کێشەی ناوچە جێناکۆکەکان. بەڵام دەسەڵاتدارانی بەغدا ١٢ ساڵ خۆیان لە جێبەجێکردنی دزیەوە و پارتی و یەکێتیش هیچ خەمیان

نەخوارد تا شەڕی داعش هەلێکی ڕخساند کە ئەو ناوچە دابڕاوانە کەوتنە دەستی پێشمەرگە بۆ پاراستنیان لە داعش.

ئەگەر کەسانی دڵسۆزو لێزان حکومڕان بوایەن ئەو هەلەیان دە قۆستەوە بۆ جێبەجێکردنی ئەو ڕیفراندۆمە کە بە گوێرەی مادە ی (١٤٠) ی دەستور دەبوو بکرایە، نەک ڕیفراندۆمە کارەساتەکەی ٢٥ ئەیلولی ٢٠١٧.

پاش ٢٧ ساڵ لە حکومڕانی پارتی و یەکیەتی کوردستان گەیشتە ئەم ئەهامەتیە کە لەبەر چاوە. هێشتا سەرانی پارتی و یەکێتیش سوورن لەسەر حکومڕانی. بەبێ گوێدانە ئەو ڕاستیە کە لە ماوەی ئەم ٢٧ ساڵەدا چەندین جار هەڵەی وەها گەورەیان کردووە کە هەرجارێکیان، ئەگەر بە پێوەرێکی عادلانە مامەڵەیان لەگەڵ بکرایە، دەبوو خۆیان دەستیان لە کاربکێشایەتەوە، یان پەرلەمان سزای بدایەن و بدرایەنە دادگا ، بۆ نمونەنە لە کاتی شەڕی برا کوژی ئەوەدەکاندا، یان لە ئەنجامی چوار ساڵ بڕینی مووچەدا، یان بەهۆی نەبوونی خزمەتگوزاری، یان لە ئەنجامی ڕیفراندۆمە کارەساتەکەدا.

دەبێ ئەوەش بوترێ کە حیزب و تاقمە ئۆپۆزسوێنەکانی هەرێم، بەتایبەتی ئەوەی نوێ و بزوتنەوەی گۆڕان، نەیانتوانی بەئەرکی خەباتگێڕی خۆیان هەڵسن، لەم بارو دۆجە ناسکەدا چونکە تا بنە قاقەیان نوقم بوون لە ململانێ بێ سەروبەری نێوان خۆیاندا . ئەم حیزبانە شایستەی لومەی توند و تیژن لەسەر ئەم سیاسەتە بێسەروبەرە . ئەگەر بیانەوێ گۆڕانکاری لە نێوان وڵاتدا بکەن دەبێ بە گۆڕانکاری لەناو خۆیاندا دەستپێبکەن ، بەسیاسەتی خۆیاندا بچنەوە، بەشێوەیەکی لێزانانە و دیموکراسیانە چارەسەریکەن، هەتا پێوەندی خۆیان لەگەڵ ئەوخەڵکەدا بەهێز بکەن و بتوانن سەرکردایەتی خەباتی جەماوەری هەرێم بکەن، بەرەو گۆڕان. ئەگەر سەرکردایەتیەکی سیاسی

ڕێکوپێکی ببێ میللەتی کورد نزیک بۆتەوە لەسەر کەوتن بەو مەرجە هێزی ئۆپۆزسوێنی هەرێم بەرمیەکی هاوکاری دروستکات بۆ گۆڕینی دەسەڵات بەلابردنی دەسەڵاتی ۲۷ ساڵەی شکستخواردوی پارتی و یەکێتی و دامەزراندنی حکومەتێکی دیموکراتی ئیئتیلافی.



پێم باشە لێرەدا نەختێ قسە لەسەر پرسی پرنسیپی خەبات لە دۆخی ئەمرۆدا بکەم کەدەبێ هێزی سیاسی خەباتگێڕی کورد پابەند بێ پێوە:

. خاڵی یەکەم ئەوەیە کە هەموان پابەندبن بە ڕێرەوی خەباتی ئاشتیانە ــ دیموکراسیانەوە، بەهیچ شێوەیەک پەنا نەبەن بۆ چەک و توندوتیژی. نابێ بە هیچ کلوژێ ئەزموونی تاڵی دیەها ساڵی ڕابوردووی خەباتی چەکداری، بەشەڕی برا کوژیشەوە، لەبیر بکرێ. نابێ ئەنفال و کیمیاباران و کاولکردنی چوار هەزار گوند لەبیر بکرێ.

ـ بواری ڕاگەیاندن. ئەمە یەکێ لەبوارە گرنگەکانە بۆ خەباتی سیاسی . دبلۆماسی، لەسەر ئاستی جیهان، بۆناساندنی ڕای گشتی و دیبلۆماسی بە کێشەی کورد. دەکرێ لەناو کوردانی عێراقی کە لە ئەمریکاو ئەوروپا و ڕوسیاو قاهیرە دەژین، خۆبەخشانە، نوسینگەی کورد بۆ ئەم کارە دروستبکرێ و ڕۆڵی خۆی ببینێ.

ـ پێویستە بە هەموو شێوازێکی گونجاو کەڵک لەو پرۆگرافە وەرگیرێ کە لەبەر نامەی ( un ) دا هاتووە و دان بە مافی چارەنووسی هەموو میللەتێکدا نراوە. دەکرێ واژۆی ملیۆنێ کەس، هاوپێچ لەگەڵ یاداشتێکی ۱۰۰ ـ ۲۰۰ کەسایەتی کورد، بدرێ بە سکرتێری گشتی ( un )، داوای ئەو مافە بکرێ بە ڕاپرسی لە ژێر چاودێری (un ) وکۆمەڵگەی نێو دەوڵەتیدا.

ـ سیاسەتی ٢٧ ساڵەی چەوتی پارتی و یەکیەتی دروشمی ( کوردایەتی ) ناشیرینتر کرد زیاد لەوەی کە خودی ڕۆژگار ناشرینی کردبوو. ئەوانە کوردایەتی بەوە تێدەگەن کە دەبێ کورد چەپڵەیان بۆلێدات مادام دەنگی تورکمان و عەرەبیان دزیوە بۆ بەرژەوەندی کورد !! نازانن، یان نایانەوەێ بزانن کە ئەم دەنگ دزینە، لەباتی باوەڕ بەیەکترکردن و پێکەوەژیانی دۆستانە، بێباوەڕی و دوژمنایەتیان لە نێوانیدا دروستدەکات. ئێمە لە چەرخی گلۆباڵدایین و ئەم جۆرە (کوردایەتیە ) باوی نەماوە. کورد دەبێ پەیوەندیەکانی خۆی لەگەڵ گەلانیتر لەسەر بنەمای مرۆڤدۆستانە دابڕێژێ و پێکەوە ژیانی برایانە دروشمی بێ. هەڵەیە بۆ ئێمە ئەگەر خراپکاری حکومڕانانی عەرەب و تورک و فارس بخەینە ئەستۆی میللەتەکانیان، ئەو میللەتە داماوانە کە گیرۆدەن بەدەست حکومڕانەکانیا وە.

ـ سەبارەت بەکێشەی ناوچە کێشەلەسەرەکان، سەرانی پارتی و یەکیەتی نەک هەر ئەوهەلەیان لە کیسدا کە شەڕی داعش خستیە دەستیان بۆ جێبەجێکردنی ڕاپرسی، بەڵکو بە ڕیفراندۆمە کارەساتەکەی کردیان کێشەکەیان زۆر زۆر ئاڵۆزترکرد، بەتایبەتی بۆ کرکوک کە گرنگترین جێگەی ئەو ناوچانەیە. بەڵێ کورد مادەی ١٤٠ ی لەدەستدا ماوەو مافی دەستوری خۆیەتی داوایجێبەجێکردنی ئەو مادە بکات. بەڵام نارەزایی عەرەب و تورکمان سەبارەت بە ڕیفراندۆم بۆ هاتنە ناو هەرێم، بەتایبەتی لەگەڵ پشتگیری بەغداو ئەنکەرە بۆ هەردولایان، کۆسپێکی گەورەیە و دەبێ بیر لە ڕێگە چارەیەکیتر بکرێتەوە. ئیستە سیاسەتی چەوتی پارتی و یەکیەتی بیانووی داوەتە دەست برا عەرەب و تورکمانەکان کە نەیەن. داوای هاتنی لێبکەیت دەڵێ :

- بۆچی بێم؟ بۆ ئەوەی مووچەم نەدرێتێ وەکو کارمەندانی هەرێم لەم چوارساڵەی ڕابردوودا تا ئەم چرکەیەش؟ بۆ ئەوەی لە قرچەی هاویندا کارەبام نەبێ و لەسەرمای زستاندا بەرمیلێ نەوتم نەدرێتێ؟ بۆ ئەوە هەڵگری ئاڵای ( کوردایەتی ) دەنگەکانمان بدزن لە هەڵبژاردنی پەرلەمانیدا؟ نامەوێ بێمە ناو کیانێ ڕژێمی وای تێدا بێ.

من وای بە باش دەزانم نەخشەیەکی نوێ پێڕەو بکرێ بۆ چارەسەری کێشەی کەرکوک لە قۆناغی ئەمڕۆدا. باشە بگەڕێینەوە سەر پرۆژەکەی نجم الدین کریم کە داوای کرد کەرکوک بکرێ بە هەرێمکی جیا لە هەرێمی کوردستان. ئەوە ئەو کاتەش هەڵوێستێکی گونجاو بوو، بەڵام لایەنگرانی (کوردایە تیە عەمارە پووەکە ) لێیڕا ستبوونەوە وە کو تاوانێکی کردبێ پرۆژەکەیان پێ مردارکردەوە. ئەو پرۆژەیە ئەمڕۆ چارەسەرێکی لەبارە.

بۆناوچە ناکۆکەکانیتریش دەبێ خەبات بەردەوام بێ بۆ دامەزراندنی ئیدارەی هاوبەش، بۆ جێبەجێکردنی مادەی ( ١٤٠ ) لەدەستور.

- لەخەباتی بەردەوامی کوردا، لە پێناوی مافە ڕەواکانیدا، دەبێ خەباتی جەماوەری تەقلیدی، چەشنی نووسینی عەریزە و واژۆکۆکردنەوە و کۆبوونەوەی جەماوەری و خۆ پیشاندان و مانگرتن، بەردەوام بێ و پەیڕەوبکرێ هەر ڕۆژێ پێویست بێ.

# ناوەڕۆك

# نووسەر لەچەند دێڕێکدا

- ١١ ی شوباتی ١٩٢٧ لە گوندی تەکیێ — قەرەداغ لە دایک بووە، کانوونی دووەمی ٩٤١ کۆچی کردووە بۆ سلێمانی.
- ٩٤٦ چۆتە ڕیزی حشع. لە حوزەیرانی ٩٤٩ بانگکراوە بۆ بەغداو بۆ چوارساڵ سەرکردایەتی حشعی کرد، ڕێخستنەکانی بنیاتنرانەوەو بە خەباتێکی جەماوەری بەر بڵاو هەستا کە لە ڕاپەڕینی تشرینی ٩٥٢ دا گەیشتە لووتکە.
- لە ١٣ ی نیسانی ١٩٥٣ دا گیراو لە دادگایەکی سەربازیدا حوکمدرا بە نیعدام. لە ژێر کەمپینێکی نارەزایدا حوکمەکە گۆڕدرا بە سجنی ئەبەدی.
- پاش نزیکەی ٦ ساڵ سجن شۆڕشی ١٤ ی تەمووز بەریدا، کەوتەکار وەکو ئەندامی مەکتەبی سیاسی حشع.
- لە ئەنجامی دژایەتی بەرەی کلکایەتی حشع لەگەڵ سەدام لە ٩٧٢ — ٩٧٩ + ڕاپێچی پێشمەرگەکانی حشع بۆ نێو شەڕی برا کوژی پارتی و یەکیتی لە ٩٨٣، خیلافاتی توند بوو لەگەڵ سەرکردایەتی. لە ٩٨٣ یاخی بوو لە جێبەجێکردنی فەرمانی سەرکردایەتی سەبارەت بە شەڕی برا کوژی. لە ٩٨٤ دا، بەبیٚ بینین و موحاسەبە، بەبیٚ ئاگادار کردنی، بڕیاری دەرکردنی لە حیزب درا. بە فێڵ بردیان بۆ گوندی مەرگە وڕ لە ناوچەی لۆلان و مانەوەی زۆرە ملێیان سەپاند بە سەریدا. هەموو هەوڵێکی بۆ دانیشتنیٚ لەگەڵ سکرتێرو مەکتەب سیاسی ڕەفز کرا. ڕێگەی لەبەردەما نەما جگە لە ڕاکردن.

هیچ گومانێک لەوەدا نیە کە بەرپرسی یەکەم لەم هەموو هەڵە و لادانە، لە تێشکان و لاوازبوونی حشع، کۆچکردوو عزیز محمد بوو.

## لەکتێبە چاپکراوەکانی بەهادین نوری بەکوردی:

١-بیرەوەریەکانی بەهادین نوری.

٢- (وێرانە) بەسەرهاتی کوردستانی عێراق لەماوەی ٦ مانگی ١٩٨٨دا.